




راڤەی (ئیساگۆجی) لەزانستی لۆژیك ( المنطق) دا

# علم المنطق



نوسینی : اثیرالدین الابهري

وەرگێران و راڤەکردنی : محمد حسن سەرگەینێلی

٢٠١٦





## ناسنامەی کتێب


**ناوی کتێب :** ڕاڤەی (ئیساگۆجی) لە زانستی لۆژیك (المنطق)دا

**نووسینی:** أثیرالدین المفضل بن عمر بن المضل الأبهري

**وەرگێڕان و ڕاڤەی :** محمد حسن سەرگەینێڵی

**بابەت :** ئایینی

**بڵاوكراوەی :** كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی

**دیزاین :** محمد حسێن خەتی

**چاپ :** یەكەم / ٢٠١٦ - هەولێر

**نرخ :** (٧٠٠٠) دینار





كتێبخانەی

**حاجی قادری كۆیی**

دیزاین - چاپكردن - بڵاوكردنەوە

٠٦٦ ٢٢٣٢٨٦٨

٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧

عێراق - كوردستان - هەولێر







**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ( ٨٥٧ ) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە.**





07504671394

hawler.chap@gmail.com

# ڕاڤەی (ئیساگۆجی) لە زانستی لۆژیك (المنطق)دا

## ( ڕاڤەیەكی وردی زانستی لۆژیكە )

## (أثيرالدين المفضل بن عمر بن المضل الأبهري)

## (ت ٦٦٣هـ - ١٢٦٤ م)

محمد حسن سەرگەینێڵی

٢٠١٦

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ ﴿١٦﴾ ﴾ النمل: ١٦

﴿ العلم نهر، والحكمة بحر، والعلماء حول البحر يطوفون، والحكماء وسط البحر يغوصون، والعارفون في سفن النجاة يسيرون ﴾ الإمام علي (عليه السلام) (جواهر البلاغة/السيد أحمد أحمد الهاشمي).

﴿ من لا معرفة له بالمنطق لا يوثق بعلمه ﴾ ﴿ من لا يحيط بالمنطق فلاثقة بعلومه البة ﴾ المستصصفى / ج١ /ص١٠/ (حجة الاسلام) الغزالي (رضي الله عنه).

﴿ المنطق قانون يعرف به صحة الفكر و فساده ﴾ (الملتقطة في المنطق). العلم الفاضل الملا عثمان دارقتةئي (رضي الله عنه).

# ناوەڕۆك

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

نووسەر: أثيرالدين المفضل بن عمر بن المضل الأبهري السمرقندي. يە

لە( الباب في تهذيب الانساب/ أبي الحسن الجزري) هاتووە ( الابهر ) بۆیەکێ لەم دوو شوێنانە دەگەڕێتەوە:

- شارۆچکەیەکە لە نزیك زنجان، کۆمەڵێ کەڵە پیاوی فیقهزان و فەرموودەزانی تێدا هەڵکەوتووە.
- گوندێکە لە ئەصفەهان، ناوی (أبهر)ە.

نووسەر لەساڵی (٦٦٣ ك) بەرامبەر (١٢٦٤ز) وەفاتی کردووە.

نوسراوەکانی:

١. ایساغوجي في المنطق.
٢. تنزيل الافكار في تعديل الاسرار في المنطق.
٣. كشف الحقائق في المنطق.
٤. زبدة الكشف و هداية الحكمة.

## پێشەکی وەرگێڕ

وەکو ئەرکێکی ئایینی و نیشتمانی پێویست و لەسەر داوای هەندێ لە قوتابیان و مامۆستایان هەڵساین بە هەڵبژاردنی کتێبی (ئیساگۆجی) لە زانستی لۆژیکدا بۆ خزمەت کردن بە قوتابخانەی کوردی، چونکە ١٧ ڕوانگەی لاوازی پێوە دیارە. بێگومان ئەو زانستەش بەشێکە لە سەرچاوەکانی مەعریفە وەکو سەرچاوەکانی فەلسەفی و عیرفانی و زانستی و کەلامی و هەموویان تەواوکەری یەکترین و خزمەت بە ئایین و زانست دەکەن.

غەزالی دەفەرموێ ( هەرکەسێ زانستی لۆژیك نەزانێ متمانە بە زانستەکەی ناکرێ ) لە بەرئەوە هەڵساین بە ڕاڤە کردن و وەرگێڕانی ئەو مەتنە ، وە بۆ دەوڵەمەند کردنی پشتمان بە چەندان سەرچاوەی تر بەست، تا توانیمان سادە و پڕمانا و پڕ زانستمان کرد کە بۆ قوتابییان ئاسان بێت و مامۆستایان لێی سوودمەند ببن. وەکو کتێبی (مغني الطلاب/اثير الدين الابهري) و (خلاصة المنطق/د.عبدالهادي الفضلي) و (شرح الرسالة الشمسية/ العلامة سعد الدين النفتازاني) و (دروس في علم المنطق/السيد حسين الصدر) و (القلائد الدراية على الفوائد الفنارية/صبغة الله) و ... هتد کە لە سەرچاوەکان و پەراوێزەکاندا ئاماژەیان بۆکراوە. هیوادارین توانیبمان خزمەتێك بە قوتابیان و خوازیارانی ئەم زانستە و هاندەرێك بێ بۆ خزمەتی زیاتر بەم بوارەیە، بۆ بەرەو پێش بردنی پرۆسەی خوێندن لە کوردستاندا، جگە لەمەش ئیساگۆجی مەتنێکی گرنگ و ئەکادیمی یە بە دنیای ئیسلامیدا.

وەرگێڕ

٢/٣/٢٠١٥ – حاجیاوە.

## زانستی لۆژیك (علم المنطق)

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد و عترته اجمعين، اما بعد فهذه رسالة في المنطق اوردنا فيها ما يجب استحضارها لمن يبتدء في شيء من العلوم مستعينا بالله انه مفيض الخير والجود.

---

**واتە:** پاشان ئەمە نامەیەکە لەبارەی لۆژیك، بەیارمەتی خودا کە سەرچاوەی خێر و بەخشندەییە هاتوین بۆ قوتابیانی سەرەتایی ئەم بوارەیە چی پێویستە لەو زانستە فێری بین نووسیومانە و باسمان کردووە.

## ڕاڤە

## زانستی لۆژیك چیە؟

زانستی لۆژیك: بریتییە لە میکانیزمێکی یاسایی، ئەو کەسەی گرنگی پێبدات زەین و هزری لە هەڵەی (بیر) و (هزر) دەپارێزێت[1].

لۆژیك وشەیەکی یۆنانییە لە ( Logos )دا هاتووە واتە: بیر، بەڵگە. بەڵام وشەی (المنطق)ی عەرەبی لە ڕووی زمانەوانییەوە ئەم مانایە نابەخشێت، تەنیا وەکو قسەی سەرزار نەبێت. بەڵام وەرگێڕان لەسەدەی دووەمدا کاتێك ویستیان

---

[1] مغنى الطلاب/ اثير الدين الابهري/ تحقيق محمود رمضان البوطي/ ص ١٩.

ئەم وشەیە وەرگێڕن لەجیاتی ( بیر ) یان (هزر) وشەی (المنطق) یان دانا[2].
هەروەها وشەی (المنطق) لە (لسان العرب)دا بە واتای گفتوگۆ یان وتە دێت.

هەروەها لۆژیک ئەوهاش پێناسە کراوە: زانستێکە لە ڕێسا گشتییەکانی بیرکردنەوەی دروست دەکۆڵێتەوە[3]. بێگومان لۆژیک بریتییە لە: زانستی بیرکردنەوەی ساغ و دروست. وەکو تەرازوویەك وایە یان پێوانەیەك کە دەتوانین شتەکانی پێ بکێشین یان بپێوین، یان وەکو ڕاستەیەك بۆ کێشانی هێڵەکان بەکاری دەهێنین تا بتوانین وێنەکە بەڕاستی بکێشین. لۆژیکیش ئەو پێوەرەیە کە بیرە چەوتەکان و بیرە ڕاستەکان لێك جیا دەکاتەوە لە دوای کێشان و پاسەدانکردنیدا.

(فارابی) پێی وایە وەکو زانستی (نەحو) وایە، چۆن زانستی نەحو زمان لە هەڵە دەپارێزێت، لۆژیکیش ئامرازێکە سەرەتا بیر لە هەڵە و چەوتی دەپارێزێت[4].

[2] مدخل الى علم المنطق/ مؤسسة المعارف الاسلامية الثقافية/ ص ٨.
[3] خلاصة المنطق/ العلامة الدكتور: عبدالهادي الفضلي/ ص ٨.
[4] دروس في علم المنطق/ حسين الصدر/ تنسيق إبراهيم السرور/ ص ١٨ بە کورت کردنەوە.

## گرنگی زانستی لۆژیك

عەلامــە (عوسمــان دارقتــەئی) دەفــەرموێ: یەکــەم شــت کەلەســەر مرۆڤــی بەرپرسیاری (شەرعی) (المکلف) پیوێستە ناسینی خودا و سیفەتەکانیەتی، بەلگە هێنانەوە بە نیشانەو و بەلگەکانی و سەلماندنی ئەو مەعریفەیەش بە زانستی لۆژیك بەدەست دێت کەواتە: فێربوونی پێویستە چونکە (ان ما یتم بە واجب فهو واجب) واتە: هەرشتێك واجبێك تەواو بکات خۆیشی دەبێ بەواجب. لۆژیك ڕێسایێکە کــە بــیری دروســت و نادروســتی پــێ جیــا دەکرێتــەوە، کۆمەڵــە مەسەلەیەکی زانراو ڕیز بەند دەکات بۆنموونە: گەر بمانــەوێ "مــرۆڤ" بناسین، پاشــان گیانــدار و بێــژەر (النــاطق) مــان زانــی، گیاندارەکــە پــێش دەخــەین و بێژەرەکە دوا دەخەین، تا بزانین مەبەستمان لە (حیوان ناطق) مرۆڤە .

دیســان گــەر ویســتمان ســاغی بکەینــەوە گــەردوون درووســتکراوە (العــالم المحدث)، دەبێ (المتغییر) بخەینەوە ناو ڕستەوە و ئـەوکات بڕیـار دەدەیـن (العـالم متغییر و کل متغییر محدث) واتە: جیهان لە گۆڕان دایە و هەموو شتێك کە گۆڕا درووستکراوە. ئەوکاتە ئەو بڕوایەمان بۆ دروست دەبێ کە جیهـان درووستبووە، گــەر ئەمــەت بــۆ یــەکلا بــۆوە تێدەگــەیت کــە مــرۆڤ توانــای پــەی بردنــی (قــوة المدرکــة)ی هەیــە. وێنــە هەســت پێکراوەکــان (صــور المحسوســات) و وێنــە عــەقڵ برەکــان (المعقــولات) شــی دەکاتــەوە وەکــو چــۆن لــە ئاوێنــە دا وێنــە هەســت پێکراوەکـان لێکدەدەرێنــەوە، ئـەو هێـزە بـە زەیـن (الـذهـن) یـان هـزر (العقـل) دەناسـرێت. ئــەو وێنەیــەی پەیـدا دەبــێ لەناویـدا بــە وێنـا (التصـور) و زانسـت

(العلم) دەناسرێ، ئەویش بۆ دوو بەش دابەش دەبێ: وێنا و بەڕاست دانان (التصديق)[5].

د. عبدالرحمن البدوی دەنووسێ: وکنز دەڵێ: لۆژیك ئەو زانستەیە لە پرینسیپە گشتییەکانی بیرکردنەوەی دروست دەکۆڵێتەوە.

ئەنۆمائیل دەڵێ: لۆژیك بەو یاسایەنە دەڵێن کە بۆ زەین و هزر بە گشتی پێویستن . بابەتەکەی توێژینەوەی خاسیەتەکانی ئەحکامەکانە نەك بەو مانایەی چەند دیاردەییەکی دەروونی یە بەڵکو بەو مانایەیە ڕێنومایی بە زانست و بڕواکانی ئێمە دەدات

بەکورتی لۆژیك ئەو زانستەیە لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی ساغ دەکۆڵێتەوە تا لەچەند دەستپێکەوە بەرەو چەند ئاکامێکیان ببات.

وە لۆژیك بۆ سێ بەش دابەش دەبێت (التصورات – وێناکان) و (القضايات – واچەکان) و (الاستدلال – بەڵگەهێنانەوە). بەڵام ئەرستۆ گرنگی بە (الإستقراء)ی نەداوە واتە: بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن، چونکە پێی وابوو چەند ئەنجامێکی گوماناوی دەبەخشێت بەڵام گرنگی بە میتۆدی بەڵگە هێنانەوە دا (المنهج الاستدلالی) و کتێبێکی تایبەتی بەناوی (التحليلات الثانية) بۆ داناوە. بەڵام هەندێ زانایانی هاوچەرخ لۆژیك دەکەن بە سێ بەشەوە: (الاستقراء) و (الاستدلال الرياضي) و (علم المعاني)[6].

[5] الملتقطة في المنطق/ العالم الفاضل الملا عثمان دارقتەنی/ص ٨.

[6] بڕوانە (الموسوعة الفلسية/ د: عبدالرحمن البدوي/ ج٢).

بەکورتی لۆژیك فێرمان دەکات :

- چۆن شتەکان پێناسە بکەین بەشێوەیەك ڕاستییەکانیان ساغ بکاتەوە و ماناکانیان ڕوون بکاتەوە.
- چۆن بەڵگە بۆ ڕاستی و هەڵەی بیرۆکەیەك بهێنینەوە.
- چۆن بەڕێکی لە زانیارییەکان بکۆڵینەوە ، لێکۆڵینەوەکە لە نەزۆکی و کەوتنە هەڵەوە دوور بخاتەوە .

کەواتە: تەواوی زانستەکان زادەی بیرکردنەوەی مرۆڤە، گەر مرۆڤیش بیر بکاتەوە سەرەنجام دەگاتە سەرەنجامێکی دروست و ڕێتیّ چوو. جاریش هەیە سەردەکێشی بۆ سەرەنجامێکی هەڵە و ناپەسەند. کەواتە: بیرکردنەوەی مرۆڤ یان مرۆڤ ڕێنوما دەکات یان بەلا ڕێی دادەبات، لەبەرئەوە پێویستە مرۆڤ بۆ گەیشتنی بە بیرکردنەوەیەکی ساغ و ئاکامێکی دروست چەند ڕێسایەکی گشتی بزانیّ، تا هەلی بیرکردنەوەیەکی ساغ و دروستی بۆ بسازێنیّ لەکاتێکدا دەیخاتە بەر نەشتەری عەقڵەوە. ئەو زانستەی ئەو ڕێسا گشتییانەی لە ئەستۆ دەگریّ بە لۆژیك دەناسریّ. واتە (ژیر بێژی).

کەواتە: لۆژیك یەکێکە لە بناغەکان بۆ زانستە مرۆییەکان. بۆیە ئەم زانستە بە (تەرازوو) یان (پێوەر) و (خزمەتکاری زانستەکان) ناسراوە. عەللامە (سعد الدین التفتازانی) دەفەرمویّ: (بابەتی لۆژیك کۆمەڵە زانیارییەکی

وێناکردن و ڕامانە یان سەلماو و پەسەندە ، چونکە بابەتی لۆژیك بە شێوەیەك لێی دەکۆڵێتەوە بە ئاقارێکی نەزانراوی ڕامانی دا دەبات یان سەلماو و پەسند)[٧].

لەکاتێکدا پێناسەی لۆژیك دەکرێ (آلة قانونية تعصم مراعاتها الذهن من الخطأ في الفكر) لێرەدا دەڵێ: ئامێرێکی یاساییە ئەو کەسەی گرنگی پێدەدات زەینی لە هەڵەی بیریی دەپارێزێت. لێرەدا ئاماژە بە (مراعاتها) دەکات، واتە: مەرج نیە هەرکەسێك لۆژیك بزانێ لە هەڵەی بیریی دوور بێت وەکو چۆن کەسێك فێرە ڕێزمانی نەحو دەبێ مەرج نیە هەڵەی ڕێزمانیی نەکات، بەڵکو پێویستە بابای لۆژیکی گرنگی بە ڕێساکانی بکات لە کاتی پێویستدا تا زەین و زمان بپارێزێت[٨].

مەبەست لە زەین: هێزێکی دەروونییە و هەستە ماددیەکان دەگرێتەوە. هەم هەستە دەروونییەکان وێنەی شتەکانی تێدا چاپ دەبێت، ئەو چاپ بوونە پێی دەگوترێ بوونی زەینی ( الوجود الذهني ) کە زانستە. هەستە ماددیەکان بریتیین لە هەستی (بینین، بیستن، بۆن کردن، تام کردن، بەرکەوتن).

هەستە دەروونییەکان: هەستە هاوبەشەکان، توانای خەیاڵ و توانای وەهم و توانای یاد و توانای فەرماندار دەگرێتەوە[٩].

دیسان گەر ئێمە زانستی لۆژیکمان زانی دەتوانین تیۆر و گریمانە زانستییەکان بخەینە بەر چەقۆی نەشتەرگەری و ڕەخنەیان لێ بگرین و

[٧] شرح الرسالة الشمسية/ العلامة سعد الدين التفتازاني/ ص ٥٤.
[٨] المنطق/ للعلامة المظفر/ ص ١٤.
[٩] المقرر شرح منطق المظفر/ السيد رائد الحيدري/ ص ١٥.

تاوتوێیان بکەین و ساغ و ناساغییان جیا بکەینەوە و هۆکارەکانیان بزانین، دیسان میتۆدو نەهجی زانستی ساغ و هەڵەی پێ پاسەدان بکەین و پاسایە زانستییە جۆرەکانیان پێ جیا بکەینەوە و تێیان بگەین.

**بەکورتی**: بەها و نرخی توێژینەوەی لۆژیکی دەکەوێتە سەر توانای پێکهێنانی توانایەکی ساغ و دروست لە لێکۆڵینەوە و ڕەخنەکاری و هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکان و بیرۆکەکان و هێنانەوەی بەڵگە لە جۆرەها بواری بیری مرۆییدا. فەیلەسوفانی (بویوراڵ) لۆژیك بە (هونەری هزر) ناو دەبەن .

## مێژووی لۆژیك

ڕابردوو باسمان کرد وشەی لۆژیك یان لۆگۆس وشەیێکی یۆنانییە بە واتای هـزر و گفتوگـۆ و بەڵگـە هێنانـەوە، یەکـەمجار لەگـەڵ (ئەکسـینوکرات) دا بـەکارهاتووە، دیسـان ئـەم زانسـتە بـەمانای (مەعریفـە) و (زانسـت) دێ وەکـو لــەکاتی بــەکارهێنانی وشــەکانی وەکــو (بایۆلۆجیــا) و (ســایکۆلۆجیا) و (سیسیۆلۆجیا) دا بەکاردەهێنرێت.

لەسـەدەی ( ٥ پ.ز) دا کۆمەڵە زانایـەك دەرکـەوتن بـەناوی (سۆفیسـتەکان) نکوڵییـان لـە واقیعیـەت دەکـرد کەلـەدەرەوە هەسـتی پێبکرێـت و دەیـانگوت: هەرچی ئێوە باسی دەکەن، کە لەدەرەوەی عەقڵەوە دێ دەرەنجامی توانـای پـەی پێبردنی خۆتانـە، هـیچ شـتێك لـە بازنـەی زەیـن و هـزرەوە بـوونی نیـە بـەڵکو ( خەیاڵێکە لە خەیاڵدا ) واتە: لە دەرەوە هیچ شتێك لە ئارادا نیـە تـا خـۆی پێـوە خـەریك بکـەن و گرنگـی پـێ بـدەن، زانسـت بـون بـە شـتێك کـە لـەئارادا نـەبێ بەشێك نیە لە کەماڵی و تەواوی. ئـەوان وەکـو ماتریالیسـتەکانی هاوچـەرخ (کـە ئەمرۆش شانازی بەو قوتابخانە سۆفیستەیە دەکەن و بە مامۆستایانی هزردوانی مۆدێرنە ناویان دەبەن) پێیان وابووە هەستە مادییەکانی مرۆڤ تاکە ڕێگەیە بۆ پەی بردن و زانینی ڕاستییەکان، نکوڵییان لەوە کردووە هیچ شتێك لـە دەردوەی بازنەی هۆشەوە هەبێ و هەستەکان نایزانن، وە ڕاستی ڕەها بوونی نیـە ، نکوڵی تەواویان لە فەلسەفە دەکرد .

بـەلام لـەو سـەر و بەنـدە ئـاڵۆزەدا، کـاتێ ئـەو قوتابخانـە ماتریالیسـتە هاتـە ئاراوە و خەریك بوو ببێ بە مەترسی بـۆ شارسـتانی یۆنـانی خـودای گـەورە دوو عـاریف و خواناسـی مـەزنی مـولهیم و فەیلەسـووفی بـۆ نـاردن کـە (سـوکرات) و (ئەفلاتون)ن، تاکو وەڵامی هەڵە گومڕاکانیان بدەنەوە.

(پرۆتۆگراس) دەیگوت: هەستەکان بنەڕەتن لە دیوی دەرەوەی هەستەکان هیچ شتێك نیە.

(گورگیاس) دەیگوت: گەردوون بەهەموو پێکهاتەکانەوە بەرێکەوت دروست بوون و هیچ دەستێك لە پشت دروستبوونیەوە نییە.

بەڵام کاتێك (سوکرات) و (ئەفلاتوون) هاتن کەوتنە توێژینەوەی ئەو بیرۆکە گریمانکارییە بینیان پڕە لە هەڵەی زانستی و لۆژیکی و فەلسەفی، چەند بنەمایەکی بیرکردنەوەی دیالێکتێکی ساغ و دروستیان دانا، سەلماندیان شتەکان لە دەرەوەی بازنەی هەستەکانەوە بونیان هەیە، ئەو بناغەیەی (سوکرات) و (ئەفلاتون) دایاننا بوو بە بەردی بناغەی لۆژیك پاشان ئەرستۆ (٣٢٢ پ.ز — ٣٨٤ پ.ز) هات سوودی لەو بناغەیەی وەرگرت و کتێبی شیتەڵکارییە سەرەتاکانی (التحلیلات الاولی)ی دانا.

ئەو (٧) فەیلەسووفانەی وڵاتی یۆنانیان ڕووناك کردەوە و بیری یەکتاپەرستییان تێدا بڵاوکردەوە و دژی ڕەوت و فەلسەفە ماددی و ئیلحادییەکان بونەوە تێیدا بریتیی بوون لە (تالس، ئەنکساگۆرس، ئەنکسیمانس، ئەنبادقلیس، فیساگۆرس، سوکرات، ئەفلاتوون).

ئەم زانایانە وەکو فەیلەسووفی ئیسلام شەهرستانی باس دەکات فەلسەفەی خۆیان چڕ کردۆتەوە لەسەر تاك و تەنیایی خودا و ئاگاداری خوا بە هەموو شتەکان، وە لەسەر داهێنان و دروستکردنی جیهان و مەعاد.

(تالس) یەکەم کەس بوو لە (مەڵتی یە) وتی: جیهان داهێنەرەکی هەیە لە ڕووی ناسنامەوە هزرەکان پەی بە سیفاتی نابەن، بەڵکو بە شوێنەوارەکانی دەناسرێن. (ئەتگساگۆرس) بەهەمان شێوە یەکتاپەرست بووە (ئەنکسیمانس) دەڵێ: ( خودا ئەزەلییە سەرەتا و کۆتایی نیە).

(ئـەنبادقلس) قوتـابی داود پێغەمبـەر (علیـه السـلام) بـووە زانسـتی لـەو وەرگرتـووە. (فیسـاگۆرس) قوتـابی سـولەیمان پێغەمبـەر (علیـه السـلام) بـووە فەلسەفەی لە تاقی پێغەمبەرایەتی وەرگرتووە.

(سـوکرات) هـاتووە لـە (ئـەتینا) بـەرەو ڕووی بـت پەرسـتان و ماتریالسـتان بۆتەوە، لەو پێناوەشدا زیندانی و ژەهر خـوارد کـراوە، کـاتێ ئـەو وەفـات دەکـات (ئەفلاتوون)ی قوتابی هاتە شوێنی ئەو، ئەویش بە یەکتاپەرست و فەیلەسووف ناسراوە.

ئـەو دەیگـوت دوو جیهـان هەیـە: جیهـانی هـزر کـە وێنـەی هـزری تێدایـە، جیهانی بەرجەستە (الحسی) کە وێنە بەرجەستەکانی تێدایە، وەکو ئاوێنـەیە کە وێنەی کەسەکان پیشان دەدات[١٠].

بێگومان لۆژیك بەر لە زانایانی یۆنانی هەبووە، لەگـەڵ دەرکـەوتنی مرۆڤـدا دەرکـەوتووە، نموونـەی ئـەو لۆژیکـە لـە گفتوگـۆی نێـوان خـودا و فریشـتەکان و خـودا و شـەیتان و خـودا و ئادەمـدا و شـەیتان و ئادەمـدا دەبینرێـت، بڕوانـە سوورەتی البقرە ئایەتی (٣٠ — ٣٨).

هەندێ زانایان پێیان وایە ڕەگی لۆژیك لەگەڵ دەرکەوتنی زانستی ماتماتیـك و ئەندازە دەرکەوتووە.

(ابن حزم) دەڵێ: ( ئەم زانسـتە لـەدڵی هـەموو بیرمەندێکدا هەیـە، زەیـن و بیری زیرەك بەهۆی ئەو توانایەی خوا پێی داوە دەتوانێ بگاتـە سـوودەکانی ئـەم زانستە.

[١٠] الملل والنحل/الشهرستاني (ص ٢٢٢ — ٢٣٤) سەیر بکە.

(ابن خلدون) پێی وایە ئەم زانستە لەگەڵ مرۆڤدا بوونی هەبووە، (ئەرستۆ) ڕێکی خستووە.

بێگومان مرۆڤ بۆخۆی گیانداریکی بێژەر و ژیرە، گیانداریکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی یە، هەموو ئەو سیفەتانە لە ئاژەڵانی جیا دەکاتەوە کە بە غەریزە چالاکیەکان ئەنجام دەدەن نەك بە هۆش و ویست.

وە ئێمە ڕۆژانە لە گفتوگۆ و ئاخاوتنەکانماندا لۆژیك بە کاردێنین لە ڕوانگەی بەڵگە هێنانەوە (الاستدلال) و (قیاس)دا. وە لەڕاست ماهیەت (چیەتی) پرسیار دەکەین، وەکو: ئەوە چییە لە بەردەممان دایە؟ دەڵێین: مرۆڤێکی بە پێکەنینە، یان کورسییەکی سوورە، لێرەدا پێناسەیەکمان کردووە، با لەڕووی خاسیەتیشەوە ناتەواوی هەبێ نەك لە ڕەگەز (جنس) و جیاکاری (الفصل) دا.

وە بڕوا وایە (عبدالله بن المقفع)، کە لە ١٣٩ کۆچی مردووە، کتێبی (ئیساگۆجی) و (ئەنالۆتیکا)ی بۆ عەرەبی وەرگێڕاوە. بەو پێیە لەسەدەی یەکەمی کۆچی دا زانا موسڵمانەکان فەلسەفەی یۆنانییان بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرگێڕاوە، (ابن رشد) دەڵێ: ( ئاوڕدانەوە لە قیاسی فیقهی لە دوای سەدەی یەکەم دەستی پێکردووە )، السیوطي دەڵێ: دوای گرتنی وڵاتە غەیرە عەرەبەکان زانستە دێرینەکان هاتۆتە ناو موسڵمانان[11].

[11] بروانە ( المنطق واصول الفقه)/ الشیخ أحمد ولد محمد محمود/ ص ٢٠.

## مانای وشەی ئیساگۆجی

وشەیەکی یۆنانییە لە سێ وشەی لێکدراو پێکدێت: (ئایس) واتە: تۆ، (ئاگۆ) واتە: من، (ئاجی) واتە: ئەوێ. یان ئەو جێگایە. پاشان لۆژیکییەکان هێناویانە کردوویانە بەزانستی (پێنج گشتییەکان – الكليات الخمس) واتە: جۆر و ڕەگەز و جیاکەرەوە ( النوع و الجنس و الفصل ) و ڕواڵەتی گشتی ( العرض العام ).

کتێبی ئیساگۆجی لە لۆژیکدا جاران لە حوجرەکانی کوردستاندا خوێنراوە، ئەم کتێبە ڕاڤەی زۆری هەیە لەوانە (مغني الطلاب). هەروەها (الفناريە) لە (صبغه الله المدیادي التلوي) کۆی کردۆتەوە. وە کتێبی ( شرح الرسالة الشمسية/ العلامة سعد الدين التفتازاني) بە پێزترینی ئەو کتێبانەیە کە لە ئاست لۆژیک دا نووسرابێ.

## بەشەکانی لۆژیک

لۆژیك دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١. لۆژیکی فۆرمی – کلاسیکی ( الشكلي – التقليدي ).
٢. لۆژیکی هێمایی ( الرمزي ) یان لۆژیکی ماتماتیکی یان لۆگاریتمی یان تیۆری ( النظري ).

هەندێك لۆژیك دەکەن بە دووبەشەوە:

لۆژیکی فۆڕمی (الشكلي) و لۆژیکی پراکتیکی (عملي).

لۆژیکی ئەرستۆیی فۆرمی و حەقیقی یە، هەرچی لۆژیکی هێماییە پەنا دەباتە بەر هێماکان نەك زامنی ئاسایی بۆ ئاسانکاری کردن. هەندێ لە دەروونزانان پێیان وایە لۆژیك بەشێکە لە دەروونزانی ( علم النفس ) چونکە (بیر) کردارێکی دەروونییە، ڕێسا و وێنە هزرییەکان چەند یاسایەکی ڕەوتی دەروونی و هەستەوەرین، لۆژیکیش وەکو باسکرا لە ڕوانگەیەکی تایبەتییەوە لە هزر و بیر دەکۆڵێتەوە. بۆ گەیشتن بە دڵنیایی و ساغ بوونەوە، دەروونزانانیش لە بیرکردنەوەی درووست و نادرووست و بیرکردنەوەی سەرەتایی و دەگمەن ... دەکۆڵێتەوە بۆیە لۆژیك بە بەشێك لە دەروونزانی دادەنێن. بەڵام جیاوازی نەکردن لە نێوان کرداره لۆژیکییەکان و کرداره دەروونییەکان ئەم دەروونزانانەی بە هەڵەدا بردووە ، چونکە دەروونزانی زانستێکی پڕاکتیکییە ، بەڵام لۆژیك لە ماهییاتەکان دەکۆڵێتەوە و تاقی ناکرێتەوە.

وە لە هەندێ کۆمەڵناسان پێیان وایە مرۆڤ زیندەوەرێکی کۆمەڵایەتییە لە سروشتدا، شیرازە و تۆڕە کۆمەلایەتییەکانی بریتییە : لە پەیوەندی لە نێوان هزرەکاندا، فکرە و بیرۆکەی حەقیقەت لە ڕێگای ژیانی کۆمەڵایەتییەوە نەبێ ڕاڤە ناکرێ، مادام بیرۆکە گشتییە و حەقیقەت کۆمەڵایەتییە لۆژیك گەردن کەچی کۆمەڵناسی دەبێت (العلم الإجتماع).

بەڵام ناشێ بڵێین لۆژیك بەشێك بێ لە کۆمەڵناسی، چونکە کۆمەڵناسی هەموو جۆرە بیرەکان لێکدەداتەوە، کۆمەڵناسان خۆیان باس لە عەقڵیەتی پێش لۆژیك دەکەن، هەرچی لۆژیکە لەوێنەی باڵای بیرکردنەوەی مرۆیی دەکۆڵێتەوە، کۆمەڵناسی زانستێکی بابەتییە چەند یاسایەکی واقیعی دادەزمەرێنێت بەڵام

لۆژیك چەند یاسایەکی هەڵسەنگاندکاری دادەنێ بە مەبەستی نموونەی باڵا لە بیرکردنەوەدا، نەك پەرەسەندنی بیرکردنەوە. کەواتە لۆژیك بیرکردنەوەی کۆمەڵ دەگۆڕێ بە لۆژیك نەوەك بیڕوێنی.

دیسان لۆژیك ڕاستییە گشتییەکانی سەرجەم کۆمەڵگاکان لەخۆدەگرێ بەڵام کۆمەڵناسی چەند حەقیقەتێکی کەمی تایبەت بە کۆمەڵێکی دیاریکراو بەرڕەسی دەکات. بۆچی لۆژیکی ئەرستۆ بە لۆژیکی فۆڕمی ناسراوە؟ بێگومان لەبەر ئەوەیە لەسەر نەهجی بەڵگە هێنانەوە دامەزراوە، بەناو بیردا ڕەت دەبێت و گرنگی بە فۆڕمی بیردەدات نەك ناوەڕۆك و مادده.

(سروشت ناسی) لە ڕێڕەوی خۆیدا بۆ دامەزراندنی پیشەی هونەری و پەی پێبردنی ڕاستی واقیعی و بەدەست هێنانی زانستێکی فراوان دەربارەی واقیعدا پەنا بۆ تاقیکردنەوە و تێبینی دەبات، ڕچەی هەڵسەنگاندن و تێ گەڕان (الاستقرائی) یان تاقیکردنەوەیی بەکاردێت. بەڵام لۆژیکی فۆڕمی و شێوەیی لە پرەنسیپە گشتییە بیرکردنەوە ڕووتەکان دەکۆڵێتەوە، بە کەڵکی ئەوە نایەت ڕاستی تازە بدۆزێتەوە، بەڵکو وەکو دیکارت باسی دەکات سوودی ئەوەی هەیە ئەو ڕاستییانە پیشان بدات.

لە ڕێگەی ڕێبازی نمایش کردنی ڕاستیە زانراوەکانەوە زانیومانن بۆ دۆزینەوەی ڕاستییە نەزانراوەکان نموونە:

- مرۆڤ گیاندارێکی ژیرە : دەست پێکێکی گەورەیە.
- محمد مرۆڤێکە : دەست پێکێکی بچووکە.

کەواتە: محمد گیاندارێکی ژیرە : ئەنجام.

ئـەم پێوانەیـە شـتێکی نـوێ ناخولقێنێـت، لـە زانراوێکـەوە بـۆ نـەزانراوێك نامانبات چونکە دەستپێکە گەورەکە ئەوەیە: مرۆڤ گیانداڕێکی ژیرە و محمدیش دەگرێتەوە.

کەواتە: پێویستی بە پێواندن (القیاس) و کرداری ئـەنجام وەرگـرتن ناکـات. بۆ وەڵامی ئەم ڕەخنەیە گوتراوە. (حوکمی گەورە) کە (مـرۆڤ گیانداڕێکی ژیـرە) بە شێوەی سروشـتێکی گشـتی هـاتووە تـەواوی تاکـەکان دەگرێتـەوە ئەوانـەی لـە ئـارادان و لـە داهـاتووش پەیـدا دەبـن. بـەڵام لـە ئەنجامـدا حوکمەکـە دەکەوێتـە سەرتاك، گە ئێستاکە لە ئارادایە یان دەکەوێتە سەر (المحمول) واتە: (هەڵگیراو) ، کە گیانداڕێکی ژیـرە.

لـە حوکمـە گەورەکـەدا پشـتی بـە بابـەتی گشـتەکی (الکلـی) بەسـتووە لـە ئەنجامدا پشتی بە بابەتی هەندەکی (الجزئی) دەبەستێت، جیاوازی نێوان ئەنجام و لێکۆڵینەوەکان جێگای لێکۆڵینەوەیە. دیسان گەر دەگـوترێ محمـد گیانـداڕێکی ژیرە لە ڕووی ڕاستییە واقیعییەکان (حقائق الواقـع) بـە درووسـت سـەیر نـاکرێ بەڵکو بە دەست پێکەکانـەوە دەبەسـترێتەوە لـە ڕووی هـزرەوە بـۆ وەڵامـی ئەمـە گوتراوە: مەرجی پێواندن (القیاس) ئەوەیە کە لەچەند دەسـتپێکێکی یـەقینی و حاشا هەڵنەگر پێك بێت، ئەو دەسـت پێکـە یەقینیانـە دەبـێ لـە ڕاسـتگۆییدا لـە ڕووی واقیعییەوە پێویست بـێ، ئینجا سەرەنجامەکان کـە لەسـەر ئـەو ڕیزبـوون دووبـارە دەبـێ لـە ڕووی واقیعیـەوە ڕاسـت بـن، هـەر هـەواڵێکی درۆ (القضـیة الکاذبة)ی ناڕاست نابێ وەکو بەشێك لە پێوانـدن وەربگیرێـت، سـەرباری ئـەوەش یـەکێ لـە نەنگییـەکانی (لـۆژیکی ئەرسـتۆیی) ئەوەیـە لـە دەسـت پێکـە ناڕاستەکانەوە (مقدمات کاذبة) ئەنجامی ڕاست بەدەست بینین:

هەموو مرۆڤێك شێرە

هەموو شێرێك ژیرە : ئەنجام هەموو مرۆڤێك ژیرە.

چونکە دروستی بەڵگە هێنانەوە (الاستدلال) لەسەر بابەتی قەزیەکان (القضايا) دانامەزرێ، بەڵکو لەسەر شێوە و فۆڕمەکانی دادەمەزرێ، بۆیە هەندێ لە زانایان پێیان وایە نابێ بۆ ڕێگای زانست و مەعریفە پشت بە پێوانی ئەرستۆ ببەسترێ، بەڵکو دەگرێ لەڕێگەی ترەوە پشتی پێ ببەسترێ ئەویش (الاستقراء) واتە تێبینی کردن و ئەزموون و لێکۆڵینەوەی گریمانکارییەکان[١٢].

فەلسەفە و زانست و عیرفان و لۆژیك و زانستی کەلام کە بەشێکن لەسەرچاوەکانی مەعریفە هەموویان ناتەواون و هەموویان دەبنە تەواو کاری یەکتریو هەموویان بۆ پاسادان کردن و لێکۆڵینەوەیان و ڕاست کردنەوەی هەڵە وچەوتەکانیان پێویستییان بە پرەنسیپەکانی (مەعریفەی قورئانییە) کە مەعیرفەی مەعریفەکانە .

## لۆژیکی ئەرستۆیی لە ڕوانگەی زانایانی ئیسلامی و خۆرئاوایی

فەیلەسووفە موسڵمانەکان لۆژیکی ئەرستۆیان وەرگرتووە و لەناو باس و لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا دایانناوە و بەرگرییان لێکردووە و دژی دوژمنانی ئەو زانستە وەستاونەتەوە، لەوانە (کندی) و (ابن رشد). ابن رشد بە دانانی لۆژیکی زانستی فیقهی هەڵسا لە نوسراوەکانی (ابن حزم) و (رساله الشافعی) و نوسراوەکانی (امام الحرمین) و (الغزالی) دا سوود لە لۆژیکی ئەرستۆ وەرگیراوە، زانستی لۆژیکی ئەو بە مەرجێك لە مەرجەکانی ئیجتیهاد دانراوە، (الغزالی) لە

[١٢] علم المنطق/ ص ١٨ -٢٠. بە کورت کردنەوە و دەستکارییەوە.

(المستصفی)دا بە فەرزی کیفایە ناوی دەبات[13]. هەروەها ئەو دەڵێت هەرکەسێك لۆژیك نەزانێ بڕوا بە زانستەکەی ناکرێ. کۆمەڵێکیش دژی لۆژیك وەستاونەتەوە و بە زەندەقە ناویان بردووە لەوانە (ابن تیمیە) و (ابن القیم الجوزیە). (ابن تیمیە) کتێبێکی نووسیوە بەناوی (رد المنطقیین) و بەرپەرچی لۆژیکییەکانی تێدا داوەتەوە[14].

بێگومان ئەرستۆ توانی لە ڕێگەی لۆژیکەوە بەرایی لەو ڕەوتە ماتریالستە ترسناکە بگرێ کە خەریك بوو شارستانییەتی یۆنانی بە ئاقارێکی مەترسیداردا ببات. لە چەرخی نوێدا کاتێ شۆڕشی زانستی تەقییەوە، (دیکارت) و (بایکۆن) و (گالیلۆ) ڕایانگەیاند کە بیری ڕووت ناتوانێ ڕاستییەکان بدۆزێتەوە ، بەڵام ئەو بیرۆکەیەی لەسەر عەینی دامەزراوە کە لای (بایکۆن) و (گالیلۆ) پشت بە ئەزموون و تێگەڕان دەبەستێ و لای دیکارت پشت بە (بەیانە ماتماتیکییەکان) دەبەستێ لەتوانایدایە زانست بەدەست بێنی و ڕاستییەکان دەربخات. وە هەرچی لۆژیکی ئەرستۆ لەلای دیکارت بەکەڵکی ئەوە نایە ڕاستییە نوێیەکان بدۆزێتەوە، ئەو ڕاستییانەی لە ڕابردوو زانیومانە ڕێبازێکە ڕاستییە زانراوەکانی پیشان داوە نەك دۆزینەوەی شتە نەزانراوەکان. دیکارت لەگەل لۆژیکی ئەرستۆدا کەوتە شەڕ تا لەبەردەم ڕێبازێکی نوێدا بوار بکاتەوە، ئەویش بواری ماتماتیکی یە، بەڕاستی ئەو بیرکردنەوەیە بەرهەم هێنەرە، پێچەوانەی پێك گرتنی (القیاس) ئەرستۆ بوو .

ئەم سێ جەمسەرە ( بایکۆن – گالیلۆ – دیکارت ) یەك دەنگن گە دەڵێن لۆژیکی کۆن سەردەمی بەسەر چووە و نەماوە، لێرەدا بابەتێکی تر هەیە

---

[13] س.پ. ل:٣٢ بە کورت کردنەوە.

[14] س.پ. ل:١٥ .

کەشایەنی لێکۆڵینەوەیە ئەویش ڕێبازی زانستییە کە لەگەڵ سروشتی زانستی نوێدا دەگونجێ، بێگومان لێرەدا (بایکۆن و گالیلۆ و دیکارت) زیادەڕەوی دەکەن لە بڕیارەکانیاندا، چونکە هەرکام لەزانست و لۆژیك و فەلسەفە و عیرفان و زانستی کەلام و ئایین مەعریفەییەکی سەربەخۆن و هەموویان پشتییان پێ دەبەسترێ و هەموویان دەبنە تەواو کەری یەکتری.

وەلەلای غزالی لۆژیك زانستێکی ئاسمانییە سەرچاوەی لە سروشتی خواوەیە. وە هەندێ لە فەیلەسووفانی ئیلاهی پێیان وایە قوتابخانەی (هرمسییە) سەرچاوەی فەلسەفەی خوایی و مەعریفەی ئیلاهی بووە، وە باسکراوە کە (هرمسی) خودی (ئیدریس پێغەمبەر بووە)، وە غەزالی لە (قسطاس المستقیم)دا دەڵێ: من بۆ یەکەمجار ئەو تەرازووەم لە قورئاندا دەرهێناوە.

زانای لۆژیکی ڕووسی (ماکوفیلسکی) پێی وایە بە درێژایی مێژوو بە دوو ڕەوتی سەربەخۆدا دابەش بووە:

یەکەمیان: لە (لۆژیکی یۆنانی) کۆنەوە سەری هەڵداوە، لۆژیکی ئەرستۆ کە بە ڕۆمانی کۆن و بیزنتیا و جۆرجیا و ئەرمینیا و وڵاتانی تری خۆرهەلاتی ناوەڕاست و ئەوروپادا بڵاوبۆتەوە.

دووەمیان: لۆژیکی (هیندی)یە، کە بە چین و تبت و مەنگۆلیا و کۆریا و یابان و ئەندەنوسیا دا لۆژیکی لەسەر دامەزراوە[١٥].

---

[١٥] المنطق والمعرفة عند الغزالي/ د. غلام حسين إبراهيم ديناني ص ٥٩-٦٠. بەکورت کردنەوە.

## خاسیەتەکانی لۆژیکی نوێ

١. لۆژیکی نوێ لۆژیکێکی بابەتییە، واتە بۆتە زانستێکی سەربەخۆ، وەکو لقێکی فەلسەفە و دەستپێکێکی فەلسەفی نەماوەتەوە. بەڵکو پشت بە چەند بنەمایەکی واقیعی دەبەستێ، کە لەناو جۆرەها زانستدا دەیدۆزیتەوە ، زانستی پێوانەیی وەکو (ماتماتیك)، یان ئەزموونگەری وەکو (سروشتناسی) و (کیمیا) یان زانستی مرۆیی وەکو (مێژوو) و (کۆمەڵناسی) و (ئابووری سیاسی).

٢. لۆژیکێکی تایبەتە و لە ڕێسا فۆرمییە گشتییەکان دەکۆڵێتەوە.

٣. لۆژیکێکی ڕێژەیی یە، وەکو لۆژیکی جاران ناڵێ لەتوانای دایە بگاتە ڕاستییە ڕەهاکان[١٦].

لۆژیك و فەلسەفە و زانستی کەلام و هەموو ئەوانە مەعریفەیەکی عەقڵین و سەرچاوەیێکن بۆ مەعریفە، قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ﴾ الحج: ٨.

هەروەها: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ ﴿٥﴾ ﴾ الجمعة: ٥.

واتە: ئەوانەی تەوراتیان هەڵگرتووە، دواتر کاریان پێ نەکردووە وەکو گوێدرێژێك وان بارێك کتێبیان هەڵگرتبێت.

[١٦] دروس في علم المنطق/ ص ١٣ ــ ١٤.

﴿ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ الأعراف: ١٧٩.

واتە: ئەوانە دڵ و هزریان هەیە و بەکاری ناهێنن بۆ تێگەیشتن، چاویان هەیە و پێی نابینن و گوێچکەیان هەیە پێی نابیستن، ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان گومڕاتریشن.

(ئارام جەلال) و ماتریالیستان پێیان وایە ئەمانە زمانێکی زبری قورئانین و سوکایەتی کردنە بە زانا و کەسایەتی ئایینەکانی تر بۆیە جێگەی ڕەخنەن.

بێگومان مەبەستی قورئان لەم ئایەتانەدا سووکایەتی کردن نیە بە مرۆڤایەتی و هەجوی نەکردووە، ماف و ئازادییەکانی کەسی پێشێل نەکردووە، ئەوەی سووکایەتی بە مرۆڤایەتی کردبێ بێ بڕوا و ماتریالیستەکانن، ئەوەتا هەیانە مرۆڤ بە مەکینە و کۆمپیوتەرێك وەسف دەکەن، هەیانە وەك (داروین) مرۆڤ بە نەوەی مەیمون دادەنێن بێگومانە ئەوانە سووکایەتین بە مرۆڤایەتی و دابەزاندنی شکۆمەندییەکەیەتی.

ئەگەر سەیری کتێبی (الانسان ذلك الكائن الفريد) بکەین لەوێدا هاتووە: مرۆڤ یەکێکە لەو ئاژەڵە سەردکییانەی بە شێوەیەکی بەرفراوان گەشەی کردووە و پەرەی سەندووە ، پەیوەندییەکی زۆری هەیە بە (بەنجی یاتەوە) کە کۆنە مەیمونێکی هاوشێوەی مرۆڤە.

بەڵام (د.جۆن مۆر) لەکاتی دانیشتنی ساڵانەی کۆمەڵەی ئەمریکی لە پێش خستنی زانستی دا گوتی: کاتێ تیۆری پەرەسەندن دەڵێ مرۆڤ لە ئەمیباوە

درووست بووە لە قوڕ و لیتەی دەریاکانەوە ئەوە بڕوای پێ ناکرێ و زانست نیە[17].

وە (د.دوان.کیش) دەڵێ: مرۆڤی ( Ramapittecus ) بریتیی نەبووە لە (مرۆڤ – مەیمون) بەڵکو بەپێی لێکۆڵینەوەی بەردیی زانەکان تەنیا مەیمونێك بووە[18].

قورئانیش فەرموویەتی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۝٣٠﴾ البقرة: ٣٠. کەواتە ئادەم و حەوا باوك و دایکی سەرەتایی مرۆڤ بوون.

ئەوەتا (پرتراندراسل) مرۆڤ بە درەندەی وەچەی گیاندارانی درندە دەناسێنێ و دەڵێ:

درەندەی سەرەتاییمان تا ڕاددەیەك نەستییە، غەریزەکان لە پێشینە کۆنەکانەوە بۆمان گوازراوەتەوە لە وەچەکانی دەرەوە[19].

یان (نانجیل کادیر) دەڵێ: ڕۆژێ دێ مەکینەی کۆمپیوتەرەکان لە مرۆڤ زۆر زیرەکتر دەبن. (سادرلاند) دەڵێ: ڕۆژێ دێ زیرەکییەکی ئەلیکترۆنی دروست بکەین شوێنی ئێمە بگرنەوە، وەك گەورەیی زەوی، وە دەنگ بدەن لە هەڵبژاردندا......[20]. بێگومان مرۆڤ توانای بیرکردنەوە و داهێنان و چاکە و خراپەی هەیە، دەتوانێ بیربکاتەوە، شیعر دەنوسێ، هەست بە خۆشی و ناخۆشی

[17] هل تعرضت لغسل الدماغ/ بروفیسور: دوان ت.کیش/ ص ٤٥/ ت. اورخان.
[18] هل تعرضت لغسل الدماغ/ بروفیسور: دوان ت.کیش/ ص ٣٥/ ت. اورخان.
[19] الانسان کائن الفرید/جون لویس/ت.د صالح جواد الکاظم/ ص ٩٨.
[20] س.پ/ ل: ١٦٦.

بکات، خاوەن ویستە، کەچی کۆمپیوتەر بەرنامە کراوە و لەو بەرنامەیە دەرناچێ.

(جی جی سمپسون) دەڵێ: مرۆڤ تاکە زیندەوەرە هەست دەکات ئەو هەڵدەچێ، ئەو تەنیا دەتوانێ گەشە بە خودی خۆی بدات[٢١].

(جولیان هکسلی) دەڵێ: سەرکەوتن و پێشکەوتنی مرۆڤ لە ڕووی بایۆلۆجییەوە نیە بەڵکو ڕووی سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتییەوەیە[٢٢].

بێگومان لەڕووی لۆژیکیەوە مرۆڤ گیانداریکە لەڕووی جۆرەوە (النوع) بەڵام جیاکەرەکەی (الفصل) ئەو قسەکەرە (الناطق).

بەڵام لەڕووی زانستییەوە مرۆڤ بە هزر و بیرکردنەوە لە گیانداران جیایە، خاوەن ویست و توانای جیاکردنەوەی چاکە و خراپەی هەیە، دەتوانێ داهێنەر بێ، سۆراغ بکات، پەرە بە هزری بدات.

خودا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التين: ٤. و ﴿۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء: ٧٠.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە جیاکاری مرۆڤ دەکات لە گیانداران، لە ڕووی بایۆلۆجی و لۆژیکی و زانستی و هزری و دەروونیەوە.

---

[٢١] س.پ / ل: ٧٤.

[٢٢] س.پ / ل: ١٢٤.

بەلام لە ڕووی ئاینییەوە مادام مرۆڤ لە ڕووی بایۆلۆجی و هزری و لۆژیکییەوە جیایە لە گیانداران، پێویستە ئایدۆلۆژیایەکی ڕاست و ڕوانینەکی ساغ لە بارەی بوونەوەر و ژیاندا بدۆزێتەوە، بەهای بەرزی مرۆڤایەتی پەیوەندییەکی توندی بە ئایدۆلۆژیا و ڕوانینە گەردوونیەکەیەوە هەیە. ئەو کەسەی بیردەکاتەوە و سۆراغ دەکات و ئایدۆلۆژیای ڕاست دەدۆزێتەوە و ڕوانینی ڕاست لە ڕاست گەردووندا بە دەست دێنێ و پاشان دەیکاتە ڕەفتار و کردەوە ئەوە بڕوادارە و بەهایەکی ئیجابی هەیە، گەرنا ئەوە لاواز و بەستەزمانە و ژێر دەستەیە وەکو گیاندارێك وایە و بەهای خۆی لە دەست داوە.

ئەمەیە مەبەستی قورئان کاتێ ڕەخنە لە عەقڵی بێ بڕوایی و ماتریالیستی دەگرێ و بەنەزان و داخراو وەسفیان دەکات:

(جورج هربرت بلونت) مامۆستای فیزیای سروشتی لە ئەمەریکادا دەڵێ: مرۆڤی بڕوادار ئیمانی خۆی لەسەر بیر ڕوونی دادەمەزرێنێ، بەلام مرۆڤی بێ بڕوا ئیمانەکەی لەسەر نابینایی و کوێری دادەمەزرێنێت. من بڕوام وایە بڕوا لەسەر هزردا دادەمەزرێ، هزر داوای بڕوا هێنان دەکات.

﴿ بڕوا بوون بەخوا لەسەر لۆژیك و قەناعەت کردن دادەمەزرێت﴾[23].

دەڵێ: لێرەدا بەلگەکان چەند جۆرێکیان هەیە: هەیانە بەلگەی گەردوونییە و هەیانە بەلگەیەکە لەسەر پەی پێبردنی فەلسەفی دا دادەمەزرێ، هەیانە توێژینەوەی مرۆڤی دەیاندۆزێتەوە. بەلگەی گەردوونی لەسەر بناغەیەك

[23] الله يتجلى في عصر العلم/ ص: ٨٣.

دادەمەزرێ کە بریتییە لەوەی گەردوون لە گۆڕان دایە، بۆیە ناشێ گەردوون ئەبەدی بێ، بۆیە پێویستە لە حەقیقەتی ئەبەدی بالآ بکۆڵینەوە، ئەو بەلگەیەی لەسەر پەی پێبردنی فەلسەفی دا دادەمەزرێ ئەوەیە کە پێویستە لە پشت ئەم گەردوونەوە مەبەستێك هەبێ. ئەویش لەلایەن کارزان و بەڕێوەبەرێك دەبێت. بەلگەی مرۆیی لەپشت سروشتی مرۆییەوە خۆی حەشارداوە. هەستی مرۆڤی لە ناخی مرۆڤدا ڕووکردنە لە یاسا دانەرێکی مەزن.

دەڵێ: دەبینرێ مولحیدەکان لۆژیکی خۆیان هەیە، بەلآم لۆژیکێکی سلبییە، دەڵێن: خودا چەند بەلگەیەکی لەسەر دەهێنرێتەوە بەلآم ئەو بەلگانە یەکلاکەرەوە نین، بەپێی لۆژیکی ئەوان خودا نیە. ئەوان دەڵێن: مادده و وزە بۆیەکتر دەگۆڕێن، بۆیە گەردوون ئەبەدییە. وە لەکاتێکدا دەڕواننە گەردوون وەکو وەهمێك سەیری دەکەن نەك وەکو سیستەمێك. دیسان نکوڵی دەکەن کە مرۆڤ لە دەروونەوە هەست بە دادگەری و ڕووکردنە ئاراستەکەرێکی مەزن بکات. هاوکات ئەوانە لە بارانیاندا نییە یەك بەلگە لەسەر نەبوونی خودا بهێننەوە[٢٤].

بەکورتی ئایین و فەلسەفە و زانست و لۆژیك ئەو کەسانە بە نەزان وەسف دەکەن کە دەڵێن: گەردوون بە ڕێکەوت درووست بووە و گەردوون ئەزەلی و ئەبەدییە، هیچ مەبەستێك لە پشت پەردەی درووستکردنی گەردوونەوە نیە.

[٢٤] س.ث/ ل ٨١.

(فرانسس بایکۆن)ی فەیلەسووف دەڵێ: کەمی فەلسەفە مرۆڤ لە بێ بڕوایی نزیک دەکاتەوە و قووڵ بوونەوە لە فەلسەفە مرۆڤ بەرەو ئایین دەگێڕێتەوە[٢٥].

(لۆرد کیفلی) سروشت ناس دەڵێ: گەر بە قووڵی بیر بکەیەوە زانست ناچارت دەکات بڕوا بە خودا بهێنیت[٢٦]. بێگومان قورئان ئەو کەسانەی هزر و لۆژیك و هەستەکان و دڵ بەکارناهێنن و ئەو وزانە سوودی لێ وەرناگرن، لە ڕیزی ئاژەڵاندا دایان دەنێن واتە نەزانن و نەیان توانیوە سوود لە هزر و هەست و ڕوح و دڵیان وەربگرن بەڵکو نزم تریشن.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ﴾الحج:

واتە: کەسانێك هەن دیالۆگ و شەڕە قسە دەکەن لەڕاست خودادا بە بێ زانست و ڕێنوما و کتێبێکی ڕووناك.

لێرەدا قورئان جیاوازی دەکات لەنێوان سەرچاوە مەعریفییەکاندا، مەبەست لە (زانست) زانستی ئەزموونگەری و ڕێگای زانستییە.

هشام بن عبدالكريم البدران دەنووسێ: لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان ڕێگای زانستی لە بیرکردنەوە و هزردا.

(ڕێگای زانستی): میتۆدێکی دیاریکراوە لە لێکۆڵینەوەدا، بۆ مەعریفەی حەقیقەتی شتێك بەکاردەهێنرێت کە لە ڕێگای تاقیکردنەوەوە ئەو شتە تاوتوێ دەکرێ، ئەم ڕێگایەش لە لێکۆڵینەوەی کەرستە بەرجەستەکاندا بەکاردەهێنرێت

[٢٥] س.ث/ ل ٣٥.
[٢٦] س.ث/ ل ٢١.

لە تاوتوێی بیرەکاندا سوودی لێ نابینرێ. ئەمەش بەوە ڕوودەدات کە ماددەی ژێرباری چەند بارودۆخ و هۆکارێکی تری غەیری دۆخ و هۆکارە بنەڕەتەکانی خۆی دەکرێ، بەتێبینی کردنی مادده و دۆخەکان و هۆکارە بنەڕەتییەکانەوە، کە ژێرباریان بووە، پاشان لەو کردارەی بەسەر مادده دادێت حەقیقەتێکی ماددی بەدەست دێنن وەك لە تاقیگەکاندا ڕوودەدات.

کەواتە ڕێگای زانستی پەیوەستە بە ماددەوە چونکە یەکێ لە بناغە سەرەکییەکانی ئەزموونگەرییە بەسەر ماددەدا بە گەردن کەچ کردنی بۆ چەند دۆخ و هۆکارێکی تری غەیری دۆخ و هۆکاری بنەڕەتی خۆی، ئەم ڕێگایە بەسەر (بیر)دا پیادە ناکرێ و ناتوانرێ تاقی بکرێتەوە، بۆیە سەرەنجامەکان بەڵگەی یەکلاکەرەوە (القطعي) نین بەڵکو جێگەی گومانن و هەڵە هەڵدەگرن.

ڕێگای دووەمی زانستی: ڕێگای (هزری)یە، ئەم ڕێگایە میتۆدێکی دیاریکراوە لە لێکۆڵینەوەدا بۆ گەیشتن بە مەعریفە و زانینی حەقیقەتی شتێك بەکاردەهێنرێ، لێی دەکۆڵرێتەوە لە ڕێگای گواستنەوەی شتێکی هەست پێکراودا لە ڕێگەی هەستەکانەوە بۆ دەماغ، زانستێکی پێش وەختە هەیە لەو ڕێگایەوە واقیعەکان ڕاڤە دەکرێ و هزر بڕیاری خۆی دەدات. ئەو بڕیارە یان بیرە یان پەی پێبردنی هزرییە، بۆ لێکۆڵینەوەی کەرستە بەرجەستەکان و لێکۆڵینەوەی بیرەکان بەکاردەهێنرێ، ڕێگایەکی سرووشتییە بۆ گەیشتن بە پەی پێبردن بە شتەکە. وەکو خۆی چۆنە ئاوا بەو کردارە پەی بەشتەکان دەبردرێ، ئەمەش دەبێتە پێناسەی هزر (عقل) لەسەر ئەو میتۆدە مرۆڤ دەتوانێ پەی بە هەر شتێکی ببات ڕابردووە یان دەیەوێ بزانێ. ئەو ئەنجامەی لێکۆڵەر لەم ڕێگایە

هزرییـــەوە پێـــی دەكـــات ئەگـــەر ئەمـــەبێ ئەنجامەكـــە، ئـــەوە بەڵگەیـــەكی یەكلاكەرەوەیە و بەهیچ شێوەیەك گومان و هەڵە هەڵناگرێ.

هەرچی توێژینەوەی لۆژیكییە كە هەندێ كەس بە ڕێگایەكی بیركردنـەوەی دادەنێن، ڕاست نیە، بەڵكو لۆژیك شـێوازێكی توێژینەوەیـە لەسـەر ڕێگـای هـزری دامـەزراوە، توێژینـەوەی لۆژیكی دامەزراندنی بیرە لەسەر بـیر، كـە سـەر دەكێشـێ بۆ هەست كردن و گەیشتن لەم بینایەوە بە ئەنجامێكی دیاریكراو وەكو: تـابلۆی نووسینەكە تەختەیـە، هـەموو تـەختـە دارێـك دەسـووتێت، ئەنجانـەكـەی ئەوەیـە تابلۆی نووسینەكە دەسووتێت[٢٧].

وشەی (الهدی) لەو ئایەتەی پێشوو ئاماژەیە بۆ فەلسەفە و لۆژیك و زانسـتی كـەلام كـە پشـت بـە هـزرەوە دەبەسـتێت. (كتـاب مـنیر) ئاماژەیـە بـۆ نامـە ئاسمانییەكان كە پشت بە سروشتی ئاسمان دەبەستێت.

قورئانی پیرۆز ئاماژە بە وشەی (لۆژیك) دەكات و دەفەرموێ: ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ ﴿١٦﴾﴾ النمل: ١٦.

لێرەدا قورئان دەری دەخات چۆن مرۆڤ لۆژیكی هەیە باڵندە و گیاندارانیش هەیانـە، كـە خـودا هـەردووكی بـە پێغەمبـەران داوە. (الاندلسی) دەڵـێ: لـۆژیكی باڵنـدە دەنگێكـە لەسـەر یـەك شـێواز مـرۆڤ لـە واتاكـانی تێـدەگات، پێچـەوانەی لۆژیك و قسەی ئێمە كە شێوازی جیا جیای هەیە و لە ماناكانیان تێدەگەین.

[٢٧] المقدمة النافعة في علم اصول المنطق/ هشام عبدالكريم البدراني، ص ٢٣ ــ ٢٥.

زاناکان گومانیان نیە هەموو گیانداران حاڵی بوون و هزریان هەیە. (شافعی) دەڵێ: کۆتر هۆشمەندترین باڵندەیە[28].

وە قورئان ئاماژە بە بەشداری هەستەکان و هزرەکان دەکات بۆ مەعریفە واتە: پەی پێ بردنی هەستی (الادراك الحسی) و بیرلێکردنەوە و لێکۆڵینەوە (الاستقراء) ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦﴾ الإسراء: ٣٦.

(السمع) و (البصر) ئاماژەن بۆ هەستەکان وەکو (بیستن) و (بینین) مەبەست لە (الفؤاد) دڵ و هزرە.

(کانت) وەکو هەر زانایەکی قوتابخانەی ئەوروپی پێی وایە هەستەکان سەرچاوەی مەعریفەن، وە دەروون و هزر سەرچاوەی دەستپێك نین بۆ مەعریفە، کەواتە: چۆن لە درێژبوونەوەی فراوانی مەعریفە دەگەین لە دەرەوەی سنووری هەستەکانەوە؟ ئەمەیان (الاستقراء) یە واتە: لێکۆڵینەوە و بیرلێکردنەوە، کە فەیلەسووفی تازە دەیکات بە سێ بەشەوە لەوانە: بەدەست هێنانی هۆکرد (المعمول) لە هۆ (العلة) ، بەدەست هێنانی شتێك لە شتێکی تر بە ڕەهایی بەهۆی بوونی پەیوەندییەکی گشتگر لە نێوانیاندا جگە لە پەیوەندی هۆکاری.

لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە و دانانی (پەی پێبردنی هەستی) بەچاوگی سەرەکی (مەعریفە) مانای مانەوە نییە لە سنووری هەستەکاندا، جۆری سێیەم

[28] س.ث/ ل ٢٠.

لە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن دا بۆ دەرەوەی پەی پێبردنی هەستی دەڕوات، بۆ هەمەکی سرووشتی و خودی سروشت دەڕوات وەك بوونەوەرێکی ناهەستی (غیر حسي)[٢٩].

لێرەدا ڕێبازی ئەزموونگەرایی کە پێی وایە تاقیکردنەوە سەرچاوەی یەکەمی زانستەکان و یاسایە بڕواپێکراوەکان و سەلماوەکانە، پێوەرە بۆ درووستی بۆچوونەکان و قەزیەکان لە بواری جیا جیادا، بۆیە دان بە زانستی پێشوەختەدا ناهێنێت تا دان بە زانستە بەڵگە نەویستەکاندا ناهێنێت تا مل بۆ ئەزموونی زانستیی کەچ نەکات، دیسان دان بە (قیاسی لۆژیکی) دا ناهێنێت تەنیا بڕوای بە گەڕان و لێکۆڵینەوەیە ، جیاوازی هەیە لەگەڵ مەزهەبی عەقڵی (زەین) کە بۆ ئاسۆیەکی فراوانتر دەکاتەوە لە مەیدانی لێکۆڵینەوە ئەزموونیەکان و غەیرە ئەزموونییەکاندا. مەزهەبی عەقڵیی پێچەوانەی مەزهەبی ئەزموونگەرایی بڕوای وایە مرۆڤ دەتوانێ بڕواتە بنج و بنەوانی گەردوونەوە.

هەست بە بابەتە هەست پێکراوەکان بکات بە زاتی خۆیان یان بە شوێنەوارەکانیان هەستییان پێبکات بە پێی کۆمەڵە مەرجێکی تایبەت بەمە، ئەو بڕوای بە جۆرەها هۆکاری لێکۆڵینەوە هەیە بۆ بەدەست هێنانی زانستەکان، بەو مەرجەی لەکۆتاییدا هزر فەرمانڕەوای بالا بێ و بڕیار بەدەستی سەروو بێ لە جۆرەها کردار و لێکۆڵینەوەی هزری دا و فلتەرێك بێ بۆ لێکۆڵینەوە هزرییەکان. کەواتە: ئەو مەزهەبە پێی وایە ئەزموونگەرایی تاکە ڕێگا نیە بۆ زانست و عیرفان بەڵکو لێرەدا زۆر ڕێگا لەبەردەم مرۆڤدایە کە سەرچاوەیەکی سەرەکی مەعریفەن وەکو (ئایین و فەلسەفە و عیرفان و زانست و لۆژیك) کە موسڵمانان بڕوایان پێەتی. جاك مارییتان (١٨٨٢) مامۆستا لە زانکۆی برنسۆن کە

---

[٢٩] الاسلام فلسفة اخيرة/ بليغث عون، ص ٨٦.

لە بنەڕەتدا سەر بە قوتابخانەی ( برگسۆن )ە، لەساڵی ١٩٣٨ کتێبەکی بەناوی (درجات المعرفه) دانا، نوسیویەتی: لێرەدا جیاوازی لە نێوان مەعریفەی زانستی سروشتی و مەعریفەی میتافیزیکی و مەعریفەی سۆفیگەری هەیە، هەموو ئەوانە تەواو کەری یەکترین و وێنەیەکی ڕاستەقینەی مەعریفەن[٣٠].

بەکورتی: مەعریفە لە زانستدا وەکو زانستی فیزیایی و کیمیایی و بایۆلۆجی پشت بە ئەزموون دەبەستێت.

مەعریفەی فەلسەفی: ئەو مەعریفەیەیە لە حەقیقەتی پەی پێبردن دەکۆڵێتەوە، ئایا دیاردەیەکی ماددیە یان نا ماددیە؟ فەلسەفە مەعریفە بە شێوەیەکی عەقڵی ڕاڤە دەکات. فەلسەفە لە قورئاندا (حکمە) واتە: دانایی، فەلسەفە لای ئەرستۆ بەشی تیۆری و کرداری دەگرێتەوە.

مەعریفەی لۆژیکی: لە یاسا گشتییەکانی دەکۆڵێتەوە، تا بابای چاودێریکار مێشك لە هەڵەی فکری چەپان بدات و ببێتە فلتەرێك بۆ ئەوە.

مەعریفەی عیرفانی: پشت بە ئیلهام و کەشف و شهوودی فریشتەیی و ڕووحەکان دەبەستێت، ئەمەش ڕێبازی سۆفییەکانە.

مەعریفەی ئایینی: پشت بە ئیلهام و سروشتی فریشتەی باڵا دەبەستێت، ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەران و ڕەوانەکراوانی خوایی، ڕێبازی ئەوان بێ هەڵە و کەم و کورییە، چونکە ڕاستەوخۆ لە خواوەیە، گشت لاگرەوەی تەواوی مەعریفەکانە و مەعریفەی مەعریفەکانە. ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴾الحج: ٨

[٣٠] الموسوعة المعرفة المختصرة/ت. فؤاد كامل/ ص ٤٠٣.

بێگومان زۆر نووسەر هەن لەم چاخەدا دەیانەوێ (لۆژیك) لە خزمەت بێ بڕوایی دا بەلا ڕێدا ببەن، دەیکەنە ئەرگیومێنتەك لەسەر نەبوونی خودا، بۆ نموونە دەلێن: بوونی خوا یەکناگرێتەوە لەگەڵ شەڕدا، گەر خودا بوونی هەبێ شەڕ بوونی نابێ کەواتە خودا بوونی نیە[٣١].

بەلاّم بێگومان لای زانایانی لۆژیکییەوە ئەرگیومێنتەکان و بەلگەکاری لۆژیکییەکان سەلمێنەری بوونی خودان لە بوونەوەردا. وەکو (کارل هایم) لە کتێبی (المسیحیة والعلوم الطبیعیة) دا دەنووسێ:

﴿ شتە سەیرەکانی گەردوون وەنەبێ هەر ڕێگا بە بوونی بڕوا بوون بدات بەلکو خەلکیش هان دەدات بێن ئەو بڕوایە دابمەزرێنن. بەلگە هێنانەوە و ئەرگیومێنتکاری بە گەردوون لەسەر هەبوونی خودا سەرلەنوێ لە چەرخی ڕاپەڕین و بیرکردنەوەی عەقلّی هاتەوە مەیدان، چونکە تیۆری ئامرازی لە ڕوونکردنەوەی گەردووندا هەرەسی هێنا، دوای ئەوەی هەولّی دا ئەم جۆرە ئەرگیومێنتە لەناو ببات﴾[٣٢].

لەبارەی پەیوەندی زانست و ئایین، سروشتناسی گەورە (لۆرد کیفکی) دەلێ: گەر بە قووڵی بیربکەیتەوە، لە داهاتوو زانست ناچارت دەکات بڕوا بەخوا بهێنی.

لەڕاست پەیوەندی فەلسەفە و ئایین فەیلەسووفی ئینگلیزی (فرانسیس بایکۆن) دەلێ: کەمی فەلسەفە مرۆڤ لە بێ بڕوایی نزیك دەکاتەوە بەلام قووڵ بوونەوە لە فەسەفەدا مرۆڤ بەرەو ئایین دەگێڕێتەوە.

---

[٣١] لۆژیك هونەری ئەرگیومێنتسازی/فارووق رەفیق/ ل ١٧٢ سەیر بکە.

[٣٢] الله یتجلى في عصر العلم/ جون كلوفر مونسا. کە بەناوی (خوا لەسەردەمی زانستی دا دەدرەوشێتەوە) وەرمانگێڕاوە. ل ٢١ -٣٥.

کەواتــە: زانســت و لۆژیــك و فەلســەفە و کــەلام و ســۆفیگەری هــەموو ئــەو سەرچاوە مەعریفیانــە لــە خزمــەت ئــایین دانــە، کــە مــەعریفــەی مــەعریفەکانــە، تــەنها ئــەو کەســانەش بــێ بــڕوان کــە نەچــوونە نــاو قــووڵایی ئــایین و زانســت و فەلســەفە و عیرفانــەوە، تــەنیا لــە لێوارەکــانی ئــەو دەریایــەدان و نــازانن چــی لــە قووڵاییەکەیدا هەیە.

**ناوەڕۆکی ئیساگۆجی لە لۆژیکدا** (وشە - اللفظ)

❀ اللفظ: الدال بالوضع يدل على تمام ما وضع له بالمطابقة و على جزئه بالتضمن، ان كان له جزء و على مالا يلازمه في الذهن بالالتزام كالانسان، فانه يدل على حيوان ناطق على حيوان الناطق بالمطابقة و على احدهما بالتضمن و على قابل العلم و صنعة الكتابة بالالتزام.

ثم اللفظ: ما مفرد و هو لايراد بالجزء منه دلالة على جزء معناه كالانسان، و اما مؤلف و هوالذي لايكون كذلك كرامي الحجارة.

---

واتە: وشە (اللفظ): دانراوێکە بەتەواوی ئەوشتە دەگەیەنێ بۆی دانراوە، بە پڕاو پڕی وەکو خۆی (المطابقة)، یان بە شتێك لەو شتە دەگەیەنێ بە تیا بوون (التضمن) بەو مەرجەی ئەو شتە یان چەمکەکە بەش بەش بێت، یان شتێك دەگەیەنێ پێوەی نووساوە لە زەینیدا بە شێوەی پەیوەست بوون پێوە، وەکو (مرۆڤ) ئەوە دەگەیەنێ گیاندارێکی قسە کەرە، ئەم مانایە پڕ بە پێستی خۆیەتی، یان مانای یەکێکیان دەگەیەنی بە تیابوون. یان توانای زانست و نووسین دەگەیەنێ کە بە مرۆڤەوە بەستراوە و پەیوەستە بەوەوە.

پاشان (وشە) یان وشەیەکی تاکە (المفرد) کە بەشێك لەو وشەیە بەشێك لەواتاکای ناگەیەنێت وەکو مرۆڤ، یان وشەیەکە لێك دراوە. وەکو بەرد هاوێژ وەك وشەی تاك وایە.

---

## ڕاڤە

## ﴿ بەشەکانی پێکهاتەی لۆژیك ﴾

بەشەکانی لۆژیك وەك لە ئیساگۆجی دا ئاماژەیان بۆکراوە، یان لە (المغنی الطلاب) دا بریتین لە:

- (وێناکان – التصورات) و (پرەنسیپی وێناکان).
- (مبادئ التصورات ) و پێنج هەمەکییەکان - الكليات الخمس).
- مەبەستەکانی وێناکردن.
- بەڕاست دانانەکان (التصديقات).
- پرەنسیپی سەلماندنەکان: قەزیەکان و یاساکانی.
- مەبەستەکانی سەلماندنەکان: پێواندن (القياس).

پێواندن بە پێی ماددەکەی پێنج بەشە، کە بریتیین لە پێنج هونەرەکان (الصناعات الخمس) لەگەڵ چوار بەشەکەی تر دەبنە نۆ بەشی لۆژیك.

### مەبەست لە زانست ( العلم )

زانست: چاپ بوونی وێنەی شتێکە لە زەیندا.

زانست دەبێ بە دووبەشەوە:

① وێناکردن (التصور).
② بەڕاست دانان (سەلماندن) (التصديق).

ئەمە دەبێتە دووبەش بۆ لۆژیك.

## ١. وێناکردن (التصور)

وێناکردن: بریتییە لە پەی پێبردنی شتێك.

بۆنموونە: سەیری نەخشەی کوردستان یان عیراق بکە کە بەسەر سەرتەوە هەڵواسراوە وێنەکەی لە زەیندا چاپ دەبێت، ئەو وێنەیەی کە لە زەینتدا چاپ بووە بریتییە لە پەی بردنت بەو نەخشەیە، ئەمەیان پێی دەگوترێ وێناکردن یان وێنە بیر.

گەر ویستت وێنەی (هەولێر) وەکو پایتەختی هەرێم بدۆزیتەوە، یان (بەغداد) وەکو پایتەختی عیراق و ماوەی نێوان ئەوان و پارێزگاکانیان بزانی، لە زەینتدا کۆمەڵێك وێنە لە ڕاست ماوەی نێوان ئەو پایتەختانە و پارێزگاکاندا دروست دەبێ، ئەو وێنەیە پەی پێ بردن و وێنای زەینی تۆیە لەو بارەوە.

گەر بۆ خشتەی پێوەرەکان بگەڕێیەوە بە پێی زانیاریەکانی ئەوە توانیت نێوان ئەو پایتەختانە و پارێزگاکانیان بدۆزیتەوە دووبارە وێنەی ئەو مەسافانەی زانیوتە لە زەینتدا درووست دەبێت. ئەو وێنەیەی دەیزانی ئەوە بە پەی پێبردن و وێنای تۆیە.

کەواتە: وێنا کردن (التصور) هاو واتای پەی پێ بردنە (الادراك)[٣٣].

**تێبینییەك**

---

[٣٣] وشەی الادراك لە چەندان ئایەتی قورئاندا هاتووە ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنعام: ١٠٣

هەندێ لە زانایانی لۆژیکی زانست دەکەن بە دوو بەشەوە (العلم الحصولي) و ( العلم الحضوري ).

وە زانستی (الحصولي) دەکەن بە دوو بەشەوە: (التصور) و (التصديق) واتا (وێنا) و (بەڕاست دانان).

مەبەست لە زانستی (الحصولى) واتە: بەدەست هێنان بۆ نموونە: لەکاتێکدا تۆ ئاگرێك دەکەویتە بەرچاوت، دەبینین سێ مەسەلە درووست بووە:

❶ مرۆڤ هەست بە ئاگرێك دەکات.

❷ ئاگرەکە لە دەرەوەیە، ئەوە پەی پێ دەبرێت.

❸ کرداری پەی پێبردن تەنها بەوە نەهاتۆتە دی کە ئەو ئاگرە هاتۆتە ناو زەینەوە چونکە دەسووتێنێت، وەئەوەی لە زەیندایە ناسووتێنێت، لەبەرئەوە پەی پێبردنی مرۆڤ بەهۆی ناوەندێکەوە ڕوودەدات کە پەیدابوونی وێنەیەکە لە زەینی مرۆڤدا. ئەوەی ئێستا لە مێشکی مرۆڤدا ڕوودەدات و زانراوە ئەو وێنەیە پەیدابووە، ئەو ئاگرە دەرەکییە بە ڕواڵەت (العرض) ناسراوە.

کەواتە: لێرەدا بە (الحصولی) ناسراوە چونکە ئەوەی زانراوە ئەو وێنەیە پەیدابووە، نەك هەمان شتی دەرەکی.

بەلام زانستی (الحضوري) لە (الحصولي) جیایە، (الحضوري) واتە: (الحاضر) چونکە ئەو زانستە ئێستا لای مرۆڤە وێنە پەی پێ برەکە نیە، بەڵکو خودی پەی پێ براوەکەیە پەیدا دەبێت.

بۆنموونە: ئەو زانستەی مرۆڤ لە ڕاست زاتی خۆی هەیەتی بە (زات) زانراوە نەوەك بە ڕوالەت (العرض) دیسان کاتێك مرۆڤ هەست بە برسیەتی و تینوویەتی و شادی و ئازار دەکات ئەمە بە زات دادەنرێ نەك بە ڕواڵەت.

هەندێ لە زانایانی تر سەرچاوەکانی زانست دەکەن بە دوو بەشەوە وەکو ( ڕۆبەرت هورتون کامیرون ) کە دەڵێ: زانست لە دوو ڕێگاوە فێری دەبین. (البصر) واتە: ئەو زانستانەی لە ئەزموونی ژیاندا فێریان دەبین.

دووەم: البصیرة: واتە ئیلهامی، ئەو ڕووناکییەی کە خودا دەیخاتە دڵەوە، ئەوەی نایزانین فێرمان دەکات[34].

## ٢. بەڕاست دانان (سەلماندن) (التصديق)[35]

التصديق واتە: بڕواهێنان بە شتێك و سەلماندنی و بەڕاست دانانی ئەو شتەیە.

بۆنموونە: بگەڕێوە نموونەی نەخشەکە، گەر ویستت بەڵگە بهێنیەوە لەسەر نێوانی هەولێر و پارێزگاکان یان بەغداد و پارێزگاکان، خشتەی پێوەرەکانت بەکار هێنا، ئەو کاتە بەڵگە (البرهان) دێنیتەوە بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەو

[34] الله يتجلى في عصر العلم/ جون كلوفر مونسا، ص ٢٨.

[35] وشەی (التصديق) لە چەندان ئایەتی قورئاندا هاتووە : ﴿ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الزمر: ٣٣

وێنانەی تۆ لە ڕاست ماوە و نێوانەکانىدا داتنابوو ئەوکاتە: بڕوا بە وێنەکان دەکەیت، بڕوا پێ کردنەکەت بریتییە لە سەلماندن و بەڕاست دانان.

یان ئەگەر وتیان: لە فلان پۆلەی قوتابخانەدا (٥٠) قوتابی هەیە، تۆش هەستایت ئەو قوتابیانەت هەژمار کرد و بینیت (٥٠) قوتابینە و باوەڕت پێ کرد، ئەو بڕوایەت بریتییە لە بەڕاست دانان و سەلماندن، بەکورتی (التصدیق) واتە (الاعتقاد)[٣٦].

لە کتێبی (تحریر القواعد المنطقیة) دا هاتووە، زانست: یان وێناکردنێکە هیچ حوکمێکی لەگەڵدا نیە، یان وێنا کردنێکە حوکمی لەگەڵدا هەیە. بە هەموویان دەگوترێ (بەڕاست دانان) (التصدیق) دیسان گەر وێنای مرۆڤمان کرد و حوکممان بەسەردا کرد (کاتب) نووسەرە و (لیس بکاتب) واتە: نووسەر نیە.

هەرچی وێناکردنە پەیدا کردنی شتێکە لە هزردا، مانای وێناکردنیش لە مرۆڤدا ناسینی وێنەکەیە لە هزردا، بەم سیفەتە عەقڵییە لە گیانداران جیا دەکرێتەوە، وەك چۆن وێنە لە ئاوێنەدا دەردەکەوێ، هەرچی ئاوێنەیە وێنە بینراوەکان پیشان دەدات، دەروونیش ئاوێنەیەکە نموونەی مەعقولەکان و هەست پێکراوەکانی تێدا مۆرك دەبێت[٣٧].

---

[٣٦] قورئان لەبارەی گرنگی بەڵگەکان دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٦٤) ﴾ النمل: ٦٤

[٣٧] (تحریر القواعد المنطقیة)/للعلامة قطب الدین الرازي/ ص ٢٢.

## بوارەکانی سەلماندن و بەڕاست دانان

بڕوا پێکردن و سەلماندن یەك بواری هەیە، واتە بڕوا پێکردن بریتییە لە بڕواییەك پەیوەندی هەیە لە نێوان بڕیاردان لە نێوان دوو شتدا.

بۆ نموونە: تۆ دەڵێی : (المناخ حار). واتە: کەش گەرمە، لێرەدا ڕستەیەکی هەواڵ گەیاندنە (الجملة الخبرية) پێکدێت لە (المسند اليه) ، کە (المناخ)ە و (المسند) ، کە (حار)ە،

نیسبەتەکە لەو نێوانەدا بڕیاردانە (الحکم) لەسەر (کەش) کە گەرمە.

بڕوابوونمان بە ڕاستی و ناڕاستی ئەو بڕیارە بریتییە لە بڕوا پێکردن (التصديق).

کەواتە: بواری بڕوا پێکردن بڕیار دانە لەسەر بوونی شتێك ، یان بڕیار دان لەسەر نەبوونی شتێك.

******

## بوارەکانی وێنا کردن (التصور)

وێناکردن: پەیوەندی بەهەموو شتێکەوە هەیە، بڕیار و غەیری بڕیار (الحکم)، تاك (المفرد) یان رستە (الجمله).

### بەشەکانی وێناکردن و بڕوا پێکردن

هەرکام لەم دوو بەشە بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبێت:

١- زەرووری و پێویست (الضروري): ئەم جۆرەیان بریتییە لە پەی پێبردنی بەڵگە نەویستیی (الادراك البديهي) کە پێویستی بە بیرکردنەوە نیە.

٢- بیردۆزی (النظري): پەی پێبردنی (بەڵگە نەویستی) نییە و پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە.

نموونە:

١- وێنای زەرووری: وەکو وێنای واتای شتێك یان وێنای مانای بوون (الوجود).

٢- وێنای بیردۆزی: وەکو وێنای ڕاستی کارەبا و ڕاستی (گیان).

٣- بڕواهێنان و سەلماندنی زەرووری: وەکو بڕوا بوونمان بەوەی کە (یەك) نیوەی (دوو)وە یان (هەمووەکی) گەورەترە لە (هەندەکی).

٤- بڕواکردنی بیردۆزی: وەکو بڕواکردن بەوەی زەوی دەسووڕێتەوە ، یان بڕوا کردنمان بەوەی ، کە گۆشەکانی سێگۆشە یەکسانە بە دوو گۆشەی وەستاو.

**پوختە:**



زانست
ویناکردن
بڕوا پێکردن
زەرووری
بیردۆزی
زەرووری
بیردۆزی

## مەبەست لە وشەی (الدلالة) لە ڕستەی ڕابردوودا

(الداله) واته: ئـەوە دەگەیـەنـێ. وشـەی (الدلالـة): (اللفظ الدال بالوضـع): واتە: پەی بردن بە شتێك بەهۆی پەیبردن بەشتێکەوە کە بەوەوە نووساوە.

بە بەشی یەکەم دەگوترێ: (دالا) واتە: ئەوە دەگەیەنێت.

بە بەشی دووەم دەگوترێ: (مدلولا) واتە: ئەوەی گەیاندووە.

بۆ نموونە کاتێك گوێت لە زەنگی دەرگا دەبێت، بـەزەینت دادێ کـە کەسـێك لەبەر دەرگا وەستاوە و زەنگ لێدەدات و دەسـتی بـەر پلاکـی زەنگەکـە کـەوتووە. ئەم بە زەین داهاتنە دەری دەخات پەیوەندی لەنێوان دەنگـی زەنگەکـە و دەسـت لە پلاکدانەکە هەیە. لێرەدا سێ شتت دەست دەکەوێت:

- (الدال): ڕێگا پیشانـدەر، گەیەنەر، لێرەدا دەنگی زەنگەکەیە.
- (المدلول علیه): گەیەندراوەکە، بوونی کەسێکە لەبەر دەرگاکە.
- (الدلاله): گەیاندن، پێویستی بـوونی کەسـێکە لەبـەر دەرگـا، بـەهۆی زانـینی دەنگی زەنگەکە.

## بەشەکانی وشە ( اللفظ )

ڕابردوو لە پێناسەکەدا هاتبوو : ﴿ اللفظ الدال بالوضع ﴾، واتە: وشەیەکە دانراوە، ئەوە دەگەیەنێت.

( ویدل علی تمام ما وضع له بالمطابقة ): ئەوە پیشان دەدات ئەو چەمکەیە پڕ بە پێستی خۆیەتی کە بۆی دانراوە، بۆنموونە: (مرۆڤ) بۆ گیانداریکی قسەکەر دانراوە، مرۆڤ پڕ بە پێستی خۆی ئەو مانایە دەگەیەنێت، (وعلی جزئه بالتضمن) ئەگەر چەمەکەکە بەش بەش بوو ئەوە بە تیابوون مانای بەشێك لەو چەمکە دەگەیەنێت، بۆ نموونە (گیاندار – قسەکەر) هەر لەو بەشانە واتاکەی مرۆڤە، بەو هێمایە دەگوترێ (چەمکی تیابوون) چونکە مرۆڤ (گیاندار)ە هەم (قەسەکەر)ە .

## بەشەکانی گەیاندن ( الدلالة )

(١) گەیاندنی هزری وشەیی (الدلالة العقلیة اللفظیة): وەکو بیستنی دەنگی مرۆڤێك لە پشت دەرگاوە مانای قسەکەرێك دەگەیەنێت.

(٢) گەیاندنی هزری بێ وشەیی (الدلالة العقلیة غیر اللفظیة): وەکو بوونی دووکەڵ ئەوە دەگەیەنێت کە ئاگرێك لە ئارادایە.

(٣) گەیاندنی سرووشتی وشەیی (الدلالة الطبیعیة اللفظیة): وەکو گوتنی (ئاخ) مانای ئازار و ئێش نیشان دەدات.

(٤) گەیاندنی سرووشتی نا وشەیی (الدلالة الطبیعیة غیر اللفظیة): وەکو لێدانی خێرایی دڵ ئاماژەیە بۆ بوونی (تا).

(٥) گەیاندنی دانراوی نا وشەیی (الدلالة الوضعیة غیر اللفظیة): وەکو بوونی نیشانەکانی هاتوچۆ و هێڵ و هێما ماتماتییەکان و تابلۆکان لەسەر شەقامەکان بۆ زانینی مەسافە و نێوانەکانی دوورییەکان.

(٦) گەیاندنی دانانی وشەیی (الدلالة الوضعیة اللفظیة): وەکو: وشەکان ماناکانیان دەبەخشن، وەکو قەڵەم مانای خۆی دەداتە دەستەوە. ئەم بەشەیانە بۆ بابای لۆژیکی گرنگە چونکە ڕێك و گونجاوە.

*********

## بەشەکانی (گەیاندنی دانانی وشەیی)

ڕابردوو بینیمان ئاماژە بە وشەی (المطابقة) و (التضمن) و (التزام) کرا و ئەمانە سێ بەشەکەی گەیاندنی دانانی وشەیی دەگەیەنن (اللفظ الدال بالوضع یدل علی تمام ما وضع له بالمطابقة، و علی جزئه بالتضمن، و علی مالا یلازمه في الذهن).

لێرەدا:

گەیاندنی پڕا و پڕ (الدلالة المطابقیة): واتە: وشەکە بۆچی دانراوە پڕا و پڕ ماناکەی خۆی دەبەخشێت. بۆ نموونە: (مرۆڤ) مانای (گیاندارێکی قسەکەر دەگەیەنێ)، (دەفتەر) مانای هەموو پەڕەکان دەگەیەنێ. (خانوو) هەموو

بەشەکانی دەگەیەنێت بە: سەقف، دیوار، دەرگا، پەنجەرە، حەوشە، ژوور، ئاودەست.....هتد.

(١) گەیاندنی تیابوون (الدلالة التضمنية): واتە: ئەم وشەیە بەشێکە لەو مانایەی بۆی دانراوە وەکو: ئۆتۆمبێلّ تایەکانی دەگەیەنیّ، کتێب بەرگەکەی دەگەیەنێت، درەخت بەرەکەی دەگەیەنێت، پۆل قوتابییەکانی دەگەیەنێت.

(٢) گەیاندنی پێوەنووسانی (الدلالة الالتزامية): واتە: ئەو وشەیە مانایەك دەبەخشێ لەدەرەوەی بابەتەکەوە بێ. وەکو (حاتەم) مانای بەخشندەیی و سەخاوەت دەگەیەنێت. لێرەدا وشەی (حاتەم) لە واتایەکدا بەکارهێنراوە کە بە ئەوەوە لکێنراوە، کە (سەخاوەتییە). بۆ نموونە دەڵێی: (خالید حاتەمە). لێرەدا مەبەست ئەوە نیە خالید حاتەمی تائی یە. بەڵکو وەسف کردنی خالیدە بە سەخاوەت. کە بە حاتەمەوە نووسێنراوە (الملازم لە). دیسان زانست و نووسین تەنیا بە مرۆڤەوە نووساوە و بەندە بە ئەوەوە.

## پوختە:


الدلالة (گەیاندن)
وشەیی (اللفظي)
نا وشەیی (غیر لفظي)
هزری (العقلي)
سروشتی (الطبیعي)
دانانی (الوضعیة)
پڕاوپڕی (المطابقیة)
تێدابوون (التضمنیة)
پێوەنووسانی (الالتزامیة)

## جۆرەکانی وشە

وشە: بۆ چەند مانایەك بەکاردێ کە بۆی دانراوە وەکو:

(١) وشەی تایبەتی (المختص): ئەم وشەیە یەك مانای هەیە وەکو: ئاسن، ئاژەڵ، زەوی، ئاسمان، قورئان.

(٢) وشەی هاوبەش (المشترك): چەند مانایەك دەبەخشێ ، وەکو: چاو (العین) بەمانای: چاوی بینین، هەم بە مانای کانیاو دێ، دیسان لە عەرەبی دا (العین) بەمانای زێڕ و جاسووسیش دێ.

(٣) گوازراوە (المنقول): ئەم وشەیە بۆ مانایەك دانراوە پاشان بۆ مانایەکی تریش بەکارهێنراوە، چونکە لەنێوان ئەو دوو مانایە گونجان هەیە، لەمانای یەکەمی دووردەکەوێتەوە کە بۆی دانراوە، وەکو (الصلاة) نوێژ سەرەتا بەمانای (دوعا) هاتووە پاشان لە شەریعەتی ئیسلامی دا بۆ دروشمی نوێژ بەکارهێنراوە. لێرەدا گونجان هەیە لەنێوان نوێژ و دوعادا.

(٤) وشەی سەرپێیی (المرتجل): ئەم وشەیە سەرەتا بۆ مانایەك دانراوە، پاشان بۆ مانایەکی تر بەکارهاتووە بە بێ بوونی پەیوەندییەکی گونجان لەناویاندا. وەکو: (جعفر ) کە بەمانای جۆگەڵە دێت. یان (الحارث) یان (الاسد) و زۆر ناوی تر.

(٥) وشەی حەقیقی: بۆئەم مانایە بەکاردێ کە بۆی دانراوە وەکو (شێر) کە بۆ گیانداریکی تایبەتی بەکاردەهێنرێ.

(٦) وشەی مەجاز: بۆ مانای غەیری خۆی بەکاردێ، لەبەر بوونی پەیوەندی یەك لەنێوان ئەو دوو مانایەدا. بۆ نموونە: شێر بۆ کەسێکی ئازا بەکاردەهێنرێ.

## پوختە:




## وشەی سادە و تاك (المفرد) و وشەی لێکدراو (المؤلف – المركب)

ڕابردوو لە مەتنەکەدا بینیمان هاتووە : ﴿ وشە تاك و سادەیە (المفرد)، یان لێك دراوە: (مؤلف) یان (المركب). وشەی سادە و تاك بەشێکی ئەو وشەیە ماناکەی ناگەیەنێت وەکو مرۆڤ (الانسان). لێرەدا (مر) یان (ان) بەمانای مرۆڤ (الانسان) نایەت.

یان وشە کە لێك دراوە وەکو (رامي الحجارة) بەرد هاوێژ، لێرەدا بەرد هاوێژ سیفەتی کەسێکە، بەلام هیچ کام لە وشەی (بەرد) و (هاوێژ) یان

(الرامي) و (الحجارة) ئەو مانایە ناگەیەنێت کە بۆی دانراوە، ئەویش وەکو وشە تاکەکە وایە ﴿

بەکورتی: وشە بۆ دوو بەش دابەش دەبێ (تاك) و (لێکدراو).

### ١- وشەی تاك (المفرد)

ئەو وشەیە بەشێك لەو نابێتە بەشێك لە واتاکەی، وەکو: ( محمد – علی – عبدالله ) لای لۆژیکەوانەکان ناو تاکە، هەرچەندە لای (نەحوی)یەکان لێکدراو بێت.

واتە بۆ نموونە: وشەی (محمد) لە ( م . ح . م . د ) پێکدێ، گەر تێبینی مانای (محمد) بکەین: ( کەسێکە بەناوی محمد وشەی محمد پیشانی دەدات ) ئەو کەسەیە لە کۆمەڵێك کۆئەندامی جیا جیای جەستەیی پێکدێت.

هەرکام لەم پیتانە ( م . ح . م . د ) بەشێك نیە لە وشەی (محمد) واتە: پیتی ( م ) مانای (محمد) ناگەیەنێت.

( ع ) مانای (عەلی) نابەخشێت. وشەی (عبدالله) کە لای ( نەحوییەکان ) وشەیەکی لێکدراوە ( المرکب ) لای لۆژیکییەکان هەر تاکە. چونکە نەحوییەکان سەیری بیناکەی دەکەن، بەڵام لۆژیکییەکان سەیری واتای وشەکە دەکەن.

واتە: بۆ نموونە: هیچ کام لەم چوار پیتانەی وشەی (محمد)یان پێکهێناوە کە لە کوردی دا بە (موحەممەد) دەنوسرێت نابنە ناوێك بۆ ئەندامەکانی لەشی (محمد) کە چەند بەشێکن مانای ئەوە دەگەیەنن.

## بەشەکانی وشەی تاك

١- ناو (الإسم): وەکو: قەڵەم، قوتابخانـە، موحەممـەد. ئەمانـە لـە (نـەحو) دا پێیان دەگوترێ (ناو).

٢- وشە (الكلمة): دەڕوا (ذهب)، دەخوات (يأكل)، بنووسە (أكتب)، ئەمانە لە (نەحو)دا کردارن (فعل).

٣- ئامراز (الأداة): وەکو: ئایا (هل)، لە (في)، بە (الباء)، ئەمانـە لـە (نـەحو) دا پیتن (الحرف).

### ٢- وشەی لێکدراو (المركب)

ئەو وشەیە بەشێك دەبێتە بەشێك لـە ماناکـەی، وەکو: (محمد نبي) واتـە: موحەممەد پێغەمبەر. ئەم وشەیە لێکدراوە لـە (محمـد) و (النبـي) پێکدێت لـە ماناشدا لـە دوو بـەش پێـك دێ: (موحەممـەد و پێغەمبەرایـەتی) لێـرەدا وشـەی (محمد) بەشـێکە لـەزاتی (محمـد) و بەشـێکە لەماناکـەی، دیسان وشـەی (النبـي) واتە: پێغەمبەر کە بەشێکە لە وشەکە لە ماناشدا بەشێکە لەو.

## بەشەکانی ناوی لێکدراو

وشەی لێکدراو دەبێ بە دوو بەشەوە:

(١) لێکدراوی ناتەواو (الناقص): بریتییە لە ڕستەیەکی ناتەواو کە باش نیە لەسەری بوەستین وەکو: (قیمة کل امرئ) واتە: نرخی هەموو کەسێك. یان ( اذا جاء علي ) واتە: ئەگەر عەلی هات.

(٢) لێکدراوی تەواو (التام): ئەو ڕستەیە یە کە تەواوە و مانایەکی بەسوود دەبەخشێت، باشە لەسەری بوەستین، لە نەجودا نوختەی بۆ دادەنرێ وەکو (محمد نبي)، (علي امام او خليفة). یان (اذا جاء علي اكرمه). واتە: ئەگەر عەلی هات ڕێزی لێ بگرە.

وشەی لێکدراویش دوو لقی لێ دەبێتەوە:

☜ ( الخبر ): ئەو ڕستە تەواوەیە ڕاست و درۆ هەڵدەگرێت وەکو: (خالد ناجح) خالید دەرچووە. واتە: دەرچوونی خالید پڕاوپڕی ڕاستی بێ ئەو خەبەر و هەواڵەکە ڕاستە، گەرنا ئەو خەبەرە درۆیە، لە باسی (القضية) دا باسی دەکەین.

☜ ( الانشاء ): ئەو ڕستە تەواوەیە ڕاست و درۆ هەڵناگرێت. بەشەکانی ( الانشاء ) زۆرە وەکو ( الامر ) و ( النهي ) و ( النداء ) و ( التمني ) و ( الترجي ). وەکو (ليت خالد ناجح). بریا خالید دەرچووبایە.

وشەی (الخبر) بە مانای (القضية) یان (القول) لە (المنطق) دا هاتووە، ئەم ڕستەیە هەواڵێکی ڕاست دەگەیەنێت، بەڵام ( الانشاء ) هەواڵێکی درووستی هەڵنەگرتووە.

**پوختە:**



**جۆرەکانی واتا (المعنى):**

**لە ڕابردوودا باسمان کرد لە ئیساگۆجی دا هاتووە:** (اما مفرد وهو الذي لا يراد بالجزء منه دلالة على جزء (معناه) كإنسان).

**مەبەست لە (المعنى) چیە ؟**

**مانا (المعنى): دەبێ بە دوو بەشەوە (المفهوم) و (المصادق):**

**(١) (المفهوم) واتە: چەمك : ئەو مانایەیە لە زەین و هۆشدا هەیە.**

**(٢) (المصادق) واتە: بەڵگەی سەلمێنەر: ئەو مانایەیە لە دەرەوەی هۆشدا هەیە.**

**بۆ نموونە: تاکەکانی مرۆڤ وەك (محمد) و (خالد) و (فاطمة) و (مريم) لە دەرەوە بوونیان هەیە، هەرکام لەمانە (مصادق)ە ، واتە: باوەڕ پێکراوە ، باوەڕی پێ دەکرێت .**

**بەڵام ماناکەی لە زەین و هۆشماندا بوونی هەیە و ئێمە هەڵی دەگرین و بەو ناوەوە دەیزانین و دەیناسین ، ئەمە چەمکە (المفهوم).**

## پەیوەندی نێوان چەمك و بەڵگەی سەلمێنەر

پەیوەندی نێوان چەمك و بەڵگەی سەلمێنەر بریتییە لە پەیوەندی پڕاوپڕی چەمك بە بەڵگە سەلمێنەرەکەوە. بۆ نموونە: (مرۆڤ گیاندارێکی قسەکەرە – الانسان حيوان ناطق) ئەمە چەمکە، هەرکام لە (محمد – خالد – مريم ) بەڵگە بڕوا پێ کراوە (المصادق) ئەوانە گیاندارێکی قسەکەرن.

والمفرد اما كلي: وهوالذي لا يمنع النفس تصور مفهومه عن وقائع الشركة (كالانسان)، و اما (الجزئي): وهو الذي يمنع تصور مفهومه عن ذلك ك(زيد).

---

واتا: تاك (المفرد) يان هەمەكی (الكلی)یە: ئەو چەمکەیە کە وێناکردنی نابێتە ڕێگر لە بەشداری کردنی کەسانی تر وەك مرۆڤ.

یان تاك (المفرد) هەندەكییە (الجزئی): ئەو چەمکەیە ڕێگا ناگرێ لە کەسانی تر بەشدار بن تێیدا وەکو: زەید.

---

# ڕاڤە

## جۆرەکانی چەمك (المفهوم)

ئەم پێناسەیەی ڕابردوو دەری دەخات تاك (المفرد) دوو لقی لێ دەبێتەوە : (هەمەکی) و (هەندەکی)، واتە ئەم چەمکە دوو بەشە.

**(١) هەندەکی (الجزئي):**

هەندەکی: ئەو چەمکەیە بەسەر کەسێك زیاتر جێبەجێ نابێ، واتا: کەسی تر لەگەڵ خۆیدا بەشدار ناکات وەکو (جەعفەر و موسا و هەڵگورد و ئاسۆ). دیسان ناوە ئاماژەکان (الاسماء الاشارة) و ڕاناوەکان (الضمائر) هەموویان هەندەکیین وەکو: (ئەمە) یان (تۆ، من، ئەو، ئێمە).

بەعەرەبی وەکو: (هذا، هذه، تلك، هؤلاء) یان ڕاناوەکان وەکو (انت – انا – هو – انتم).

## بەشەکانی هەندەکی (الجزئي)

هەندەکی دووکەڵی لێدەبێتەوە:

- ✓ هەندەکی حەقیقی (الجزئي الحقيقي): ئەو هەندەکیەیە پێناسەی ڕابردوو دەیگرێتەوە.
- ✓ هەندەکی سەرباری (الجزئي الأضائي): ئەو چەمکەیە لە ژێر چەمێکیکی فراوانتردا باس کراوە، وەکو (قەحتان – مرۆڤ : قحطان – انسان).

بەڵام هەندەکی سەرباری وەکو (قحطـان) هەنـدێك جار دەبێتـە (هەنـدەکی حەقیقی)، پێناسەی هەنـدەکی حـەقیقی دەیگرێتـەوە، گـەر چووە ژێـر چـەمکی (مرۆڤ) کە ماناکەی فراوانـترە ئەو کاتە دەبێتە (هەندەکی سەرباری).

هەندێك جار هەمەکی (کلي) یە وەکو مرۆڤ (الانسان) چونکە لـە ژێـر نـاوی گیاندار (الحیوان) دا باس دەکرێت.

**(٢) چەمکی هەمەکی (الکلي):**

چەمکی هەمەکی دەتوانرێ کەسانی تریشی بەشـدار پـێ بکـرێ، نـەك یـەك کەس بگرێتەوە، وەکو (مرۆڤ) و (کتێب) و (قوتابخانە).

## بەشەکانی هەمەکی

دەبێتە دوو بەش :

1. یەکسان (المتواطئ): ئەو چەمکەیە پڕ بە پێستی خۆی بەڵگە بڕواپێکراو (المصـاديق) دەگرێتـەوە، وەك ( مـرۆڤ — الانسـان ) و زێـڕ (الـذهب) یـان (محمد) و (جعفر) و (زيد).
2. چـەمکی جیـاواز (المشـكك): ئـەو چـەمکە هەمەکیەیـە بـە جیـاوازی و نایەکسانی لەگەڵ بەڵگەی بڕواپێکراوەکە یەك دەگرێتەوە وەکو (بـوون — الوجـود) و (سـپی — البیـاض). (بـوونی کردگـار) لـە پێشـترە لـە بـوونی درووسـتکراوان. وە هـۆ (العلـة) دەکەوێتـە پـێش بـوونی هـۆگر (المعلـول) هەمووشیان لە بوون (الوجود) دا هاوبەشن.

یان ڕەنگی سپی (البیـاض) تاکـەکانی وەکـو یـەك نـین لـە سـپی بووندا، بـۆ نموونە: بەفر لە پەڕە سپی ترە، هەمووشیان ڕەنگی سپییان هەیە.

**پوختە:**


واتا (المعنى)
بەڵگەی سەلماو (المصداق)
چەمك
هەمەکی (الكلي)
هەندەکی (الجزئي)
جیاواز (المشكك)
یەکسان (المتواطئ)

(الذاتي) و (العرضي)

والكلي اما ذاتي: وهو الذي يدخل في حقيقة جزئياته كالحيوان بالنسبة الى الانسان و الفرس. و اما عرضي وهو الذي يخالفه كالضاحك بالنسبة الى الانسان.

---

**واتە: وشەی هەمەکی یان خودیی (زاتی)یە، کە ئەو چەمکەیە دەچێتە ناو چەمکی هەندەکییەکانەوە وەکو گیاندار لە هەمبەر مرۆڤ و ئەسپدا.**

**یان ئەوەتا وشەی (هەمەکی): ڕواڵەتی (العرضي)یە و زاتی نییە، پێچەوانەی ئەوە، واتە ناچێتە ناو چەمکی هەندەکییەوە وەکو ئەو کەسەی پێدەکەنێت لە هەمبەر مرۆڤدا: (بە پێکەنین – پێکنەر – ضاحك).**

---

**ڕاڤە: پێنج هەمەکییەکان (الكليات الخمسه)**

**پێنج هەمەکییەکان بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبن:**

**٣- خودی (الذاتي) چی یە ؟**

**خودی: ئەو هەمەکیەیە بە حەقیقەتێکی سەربەخۆ دەناسرێ، یان بەشێکە لە حەقیقەت، وەکو مرۆڤ (الانسان)، کە حەقیقەتێکی سەربەخۆیە، بەڵام گیاندار بەشێکە لە حەقیقەتی مرۆڤ، کە لە (گیاندار – الحيوان) و (قسەکەر – الناطق) پێکدێت. قسەکەریش بەشێکە لە حەقیقەتی مرۆڤ.**

## بەشەکانی خودی

خودی دەبێت بە سێ کەڵەوە یان لقەوە:

(١) جۆر (النوع): تاکەکانی لە حەقیقەتدا ڕێك کەوتووە، بە ژمارە زۆرە، جۆر ئەو (هەمەکی) یەیە پڕاوپڕی هەندەکییەکانی یەك حەقیقەتە. وەکو (مرۆڤ) کە پڕاوپڕی (خالید و عەلی و ئەحمەد) و ئەو هەندەکییانە لە حەقیقەتی مرۆیی دا ڕێك دەکەون.

(٢) ڕەگەز (الجنس): تاکەکانی زۆرە لە حەقیقەت و ژمارەدا، ڕەگەز ئەو هەمەکی یەیە چەندان (جۆر)ی جیاواز دەگرێتەوە، وەکو گیاندار (الحیوان)، کە مرۆڤ و باڵندە و ماسی دەگرێتە خۆیەوە.

(٣) جیاکار (الفصل): ئەو هەمەکی یەیە (جۆرەکان) لێك جیا دەکاتەوە کە بەشدارن لە (ڕەگەز) دا، وەکو قسەکەر کە جۆری (مرۆڤ) جیادەکاتەوە لەوجۆرانەی بەشدارن لە ڕەگەز (الجنس)ی گیاندار دا. وەکو جۆری (شێر) و جۆری (باڵندە) و جۆری (فیل) و جۆری ماسی.

### ٤- ڕواڵەتی (العرضي)

ئەم هەمەکییە زاتی نییە بەڵکو سیفەتە، واتە: ئەو هەمەکییە دەبێتەوە سیفەتێکی حەقیقەتەکە، وەکو بە پێکەنین (الضاحك)، کە بە وەسفێکی مرۆڤ دادەنرێت وەکو (الماشي).

کە بەوەسفێك دادەنرێت بۆ مرۆڤ و گیاندار، چونکە لە ڕۆیشتندا بەشدارن.

## بەشەکانی هەمەکی ڕواڵەتی (العرضي):

١- تایبەت (الخاصة): ئەو هەمەکیەیە تایبەتە بەیەك جۆر، وەکو (بە پێکەنین – الضاحك) کە سیفەتێکە تایبەتە بە مرۆڤەوە.

٢- ڕواڵەتی گشتی (العرض العام): ئەو هەمەکییە گشتیەیە وەسفێکە بۆ جۆرەهای جیاواز وەکو (الماشی) ئەو سیفەتەی ڕۆیشتن بۆ مرۆڤ و ئەسپ و شێر و فیل وەك یەکە.

شێخ (أحمد ولد محمد محمود) دەنوسێ: کاتێ ئەرستۆ دەڵێ (لا علم الا بالكلي) واتە: هیچ زانستێك بەبێ هەمەکی بەکار نایەت. لێرەدا مەبەست ڕەگەز و جیاکار و جۆر و تایبەت و ڕواڵەتە.بەبێ ئەو هەمەکییانە ناتوانین هیچ شتێك بناسین. پێناسە (الحد) بەو هەمەکییانە،دروست دەبێت، لەبەرئەوە بە بڕبڕەی پشتی پێناسە دادەنرێت و بناغەی سەرەکی لۆژیکە.

بۆ نموونە: کاتێك پێناسەی شتێکمان کرد (ڕەگەز) و جیاکاری جۆری ئەومان باسکرد وەکو (الانسان حيوان ناطق) واتە: مرۆڤ گیانداڕێکی قسەکەرە.

واتە: پێناسەکەمان بۆئەو ماهییەتە واتە: مرۆڤمان لەهەموو ڕوویەکەوە درووست کردووە، بە ماهیەتەوە، ئەو هەمەکییانە (الكليات) هەیانە خودییە کە پێناسەیەکی تەواو (الحد الكامل) دەبەخشێت، کە (ڕەگەز و جیاکاری و جۆر)ە،

یان (تایبەت و ڕواڵەتی گشتی)یە، ئەوانە پێناسەیەکی تەواو (الحد التام) نادەن بەڵکو پێناسەیان ناتەواوە (الحد الناقص)[38].

## نەخشەی پێنج هەمەکیەکان

مرۆڤ (الانسان): ⟵ گیاندار ⟵ بیرکەرەوە (المفکر) ⟵ بە پێکەنین (الضاحك)

لەسەر دوو پێ دەڕوا.

جۆر (النوع): ⟵ ڕەگەز (الجنس) ⟵ جیاکار (الفصل) ⟵ تایبەت (الخاص)

ڕواڵەتی گشتی (العرض العام).

ئەم پێنج خشتەکییانە لە مەزهەبی ( ئەرستۆ ) و ( فرفریۆس ) تێکەڵ کردووە.

★★★★★★★★★★

[38] المنطق و اصول الفقه/ ص ٤٣.

## درەختی فورفریۆس

لێرەدا ئاستەکان لەم درەختەدا، یان شەجەرەیەدا واتە: ئاستەکانی ڕەگەز (مراتب الجنس) ئاوا بەش کراون:

(١) جەوهەر: ڕەگەزی ڕەگەزەکانە، یان ڕەگەزی باڵا (الجنس العالي )یە.

(٢) تەن (الجسم): جۆری باڵا (النوع العالي) یان ڕەگەزی ناوەند (الجنس المتوسط).

(٣) تەنی زیندوو (جسم حي): ڕەگەزی ناوەند یان جۆری ناوەند.

(٤) مرۆڤ: جۆری جۆرەکان (نوع الانواع) یان جۆری خواروو (النوع السافل).

ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ورفوریۆس: چەند تاکێکن (الافراد). بێگومان کاتێ (فرفریۆس) هات سەیری (المحمول)ەکانی ئەرستۆی کرد و پێناسەی (الحد)ی گۆڕی بۆ جۆر (النوع ).

ئەو هەڵگیراوانەی (المحمولات) بەچەند جۆرێکی وشەی هەمەکی دانا و بە (پێنج هەمەکییەکان)ی ناساندن تا ئەمڕۆش بەو ناوە ناسراون.

## بەشەکانی ڕەگەز (الجنس)

ڕەگەز دەبێ بە دوو جۆر:

(١) ڕەگەزی نزیك (الجنس القریب): نزیکترین ڕەگەزە لە جۆرەکەی، وەکو گیاندار (الحیوان) گەر درایە پاڵ مرۆڤ.

(٢)ڕەگەزی دوور (البعید): بەدوای ڕەگەزی نزیکدا دێت، وەکو لەشی زیندوو (الجسم الحی) گەر درایە پاڵ مرۆڤ ئەوا دوایی گیاندار (الحیوان) دێت.

مرۆڤ (الانسان) ← گیاندار (الحیوان) ← جەستەی زیندوو (الجسم الحی)

↓ ↓ ↓

جۆر (النوع) ← ڕەگەزی نزیك (الجنس القریب) ← ڕەگەزی دوور (الجنس البعید)

**********

## بەشەکانی جیاکار (الفصل) .

جیاکار (الفصل) دەبێت بە دوو بەشەوە:

١- جیاکاری نزیك (الفصل القریب): نزیکترین جیاکارە لە جۆرەکەی وەکو: قسەکەر (الناطق) ئەگەر درایە پاڵ مرۆڤ.

٢- جیاکـاری دوور (الفصـل البعیـد): دوای جیاکـاری نزیـك دێ، وەکـو (الحساس المتحرك بالارادة) واتە: (هەستیاری بزۆك بەویست) ئەمە جیاکاری جۆری گیاندارە گەر درایە پاڵ مرۆڤ.

مرۆڤ (الانسان) گیاندار (الحیوان) هەستیاری بـزۆك بەویست (الحساس المتحرك بالارادة)







جۆر (النوع) جیاکاری نزیـك (الفصـل القریـب) جیاکاری دوور (الفصل البعید)

لێرەدا نووسەر ئاماژە بەو قسانە دەکات و بەم شێوەیە پێناسەیان دەکات:

## گوتەزا (المقول)

(الذاتي) ما مقول في جواب (ماهو)؟ بحسب الشركة المخصة كالحيوان بالنسبة الى (الانسان) و (الفرس) وهو (الجنس).

واتە: وشەی خودی: یان گوتەزاییێکە بۆ وەلامی ئەو پرسیارە دەگوترێ (ئەوە چییە؟) بە پێی هاوبەشییەکی ڕووت و پەتی، وەکو گیاندار لەهەمبەر مرۆڤ و ئەسپ، ئەوەیان ڕەگەزە.

## ڕاڤە

واتە: لە کاتێکدا لە ماهییەتی شتێك دەپرسین ئەوە چییە؟ مرۆڤە یان ئەسپە؟ لەوەلامدا دەڵێین: گیاندارە، لێرەدا (گیاندار) دەبێتە ڕەگەز (الجنس) بۆ هەردووکیان، چونکە هەردووکیان دەگرێتەوە.

کەواتە: ڕەگەز هەمەکییە لە تاکدا، چەندان حەقیقەت دەگرێتەوە، وەکو (گیاندار) کە مرۆڤ و ئاژەڵانی تری وەکو ئەسپ دەگرێتەوە ئەوان چەند حەقیقەتێکی جیاوازن، ئەسپ حەقیقەتی مرۆڤ نیە، بە پێچەوانەوەش. لێرەدا لەم پرسیارە بە پێی هاوبەشییە ﴿كالحيوان بالنسبة الى (الانسان) و (الفرس) وهو (الجنس)﴾ (الحيوان) وەڵامە بۆ پرسیاری (ما الانسان و الفرس)؟ واتە: مرۆڤ و ئەسپ چین؟ نەك بپرسی: مرۆڤ چییە؟ لێرەدا پرسیارکەر لە تەواوی حەقیقەتەکە دەپرسێ، لێرەدا (الحيوان) تەواوی حەقیقەتی مرۆڤ نییە کە تایبەت بە ئەو بێ، بەڵکو تەواوی حەقیقەتەکە هاوبەشە لەگەڵ ئەسپدا، لێرەدا پرسیار لەچەند حەقیقەتێك دەگرێ (ڕابردوو ڕاڤەی زیاترمان باس کردووە) بۆی بگەڕێوە.

## ڕەگەز (النوع)

ويرسم بانه كلي مقول على كثيرين مختلفين بالحقائق في جواب ماهو؟ واما مقول في جواب ماهو بحسب الشركة والخصوصية معا، كالانسان بالنسبة الى زيد و عمر و هو النوع، ويرسم بانه كلي مقول على كثيرين دون الحقيقة في جواب ( ماهو )؟

---

**واتە: ئەو (ڕەگەز)ە بەو مانایە دەناسرێ کە هەمەکی (کلی)یە و گوتەزاییێکە پرسیاری پێ لە هەندەکی (الجزئی) دەکرێ کە لە حەقیقەتدا لێك جیاوازن، بەڵام لە ڕەگەز دا هاوبەشن.**

**دەپرسێ: ئەوە چییە؟ یان تاکێکی هەمەکییە (المفرد الکلی) دەبێتە گوتەزاییێك بۆ وەڵامی ئەوە چییە؟ بە پێی هاوبەشییەت (الشرکە) و تایبەتیەت (الخصوصیە) لەگەڵ یەکتری دا، وەکو (مرۆڤ) لە بارەی زەید و عەمر دا، ئەمەیان جۆر (النوع)ە.**

**ئەو پرسیارەی وەڵامی (جۆر) دەداتەوە ئەویش بەو شێوەیە دەناسرێ کە (هەمەکی)یە، بە زۆرێك لەو شتانە دەگوترێ کە لە ژمارەدا لێك جیاوازن نەك لە حەقیقەتدا و پرسیار دەکرێ ئەوە چییە؟.**

## ڕاڤە

لێرەدا دەبینین باس دەکات: زۆر لەوانەی باسکران (هەمەکی)ن و گوتەزان، ئینجا باس دەکات لەژمارەدا جیان نەك لە حەقیقەتدا: تاوەکو لە ڕەگەز (الجنس) و تایبەتییەکەی (الخاص) و ڕواڵەتی گشتی و جیاکاری دوور خۆی بە دوور بگرێت. کە دەپرسێ ئەوە چییە؟ خۆی لە جیاکاری نزیك و تایبەتی جۆر (خاص النوع) بەدوور دەگرێ، ئەم دووانە گوتەزان بۆ وەڵامی: ئەوە چییە لە (خود) دا یان لە (ڕواڵەت) دا؟

بێگومان چییەتی (الماهیە) لە فەلسەفە و لۆژیکدا زۆر بەکاردەهێنرێ بۆ حاڵی بوون لە پێنج هەمەکییەکان (الکلیات الخمس) بە سوودە.

کاتێك دەپرسی چی لەو زەرفە یان جانتایەدایە؟ لێرەدا پرسیار لە چییەتی کراوە. بەڵام گەر پرسیت شتێك لەو جانتایەدا هەیە؟ ئەوا پرسیار لە هەبوون و نەبوون دەکرێ.

بۆ نموونە ئەگەر بڵێی پارە، جل و بەرگ، کتێب ئەوانە چییەتی دەگەیەنن. هەموو ئەوانە لە چییەتی دا لە یەکتری جیاوازن.

دیسان (جۆر) چیەتی یە، کاتێك پرسیار لە بابەتێکی هەندەکی (الجزئی) دەکەین و دەڵێین: ئەوە چییە؟ دەگوترێ (جۆرە) یان دەبینی گیاندارێك لە دوورەوە والایی دیارە دەپرسین ئەوە چییە؟ دەگوترێ: مرۆڤە، ئەسپە، هەموو ئەوانە جۆرن، وەکو باسکرا.

وە چییەتیەکانی یەك جۆر وەکو مرۆڤ لە چیەتی جیاوازییان نییە وەکو (محمد – علی) ئەوانە لە چیەتی دا جیاوازییان نییە هەموویان لە جۆردا مرۆڤن، بەڵام لە ڕواڵەت دا جیاوازن، هەموویان قسەکەرن (الناطق) و لە شتێکی گەشەکردوو هەستیاریان هەیە و دەجولێنەوە، بەڵام لە ڕواڵەتدا وەکو: جیاوازی ڕەنگ و ساغی و نەخۆشی و گەنجی و پیری لە یەکتری جیاوازن. کەواتە: (جۆر) ئەوە هەمەکییە خودیەیە بەشەکانی لە ڕووی چیەتییەوە لێك جیاواز نیە، لەوەلامی ئەوە ئەوە چیە دادێ، ڕاستییەکە پڕا و پڕی مانای چیەتییەکە دەگەیەنێت.

ڕەگەزیش (الجنس) وەکو باسکرا (هەمەکی خودی)یە، بەشەکانی لە ڕووی چیەتییەوە جیاوازە، بۆ نموونە: گیاندار ڕاستە ڕەگەزە بۆ (مرۆڤ) و گیاندارێکی وەکو ئەسپ، بەڵام ئەوانە جۆرگەلێکن لەچییەتی جیاوازدا.

کەواتە (ڕەگەز) بەشی (چییەتی؟) جیاواز لە خۆی دەگرێ، بەڵام بەشەکانی ڕەگەز لەهەموو لایەکەوە لەیەکتری جیاوازنین، تەنیا لە جیاکار (الفصل) دا نەبێ، وەکو قسەکردن بۆ مرۆڤ، کە لە ئەسپ و گیانداری تری جیا دەکاتەوە.

کاتێك باسی ڕواڵەتی گشتی دەکەین ئەوە هەمەکییەکی ڕواڵەتییە، جۆری جیاواز دەگرێتەوە، وەکو (جوڵە) ئەو سیفەتە مرۆڤ و گیانداریش دەگرێتەوە، بۆیە جوڵە ڕواڵەتێکی گشتییە بۆ مرۆڤ.

بەڵام (ڕواڵەتی تایبەتی) هەمەکییەکی ڕواڵەتییە ، تایبەتە بە چیەتییەوە وەکو (پێکەنین) بۆ مرۆڤ، یان نووسەر، مامۆستا، نوژدار، هەموو ئەوانە ڕواڵەتی تایبەتی مرۆڤن و گیاندارانی تر بەشداری ناکەن تیایدا. وەکو نووسەر دەڵێ:

و اما غير المقول في جواب (ماهو؟) بل مقول في جواب أي شئ هو في ذاته و هوالذي يميزه الشئ عما يشاركه كالناطق بالنسبة الى الانسان وهو (الفصل).

ويرسم بانه كلي مقول على شئ في جواب اي شيئ هو في ذاته؟

---

واتە: یان وەلامی (ئەوە چییە؟) نابێتە گوتەزا ، بۆ وەڵامی پرسیاری (ئەوە چییە لە زاتدا؟) ئەمەیە جیای دەکاتەوە لەهاوبەشکردنی دا، وەکو قسەکەر (الناطق) بۆ مرۆڤ، ئەمەیان پێی دەگوترێ جیاکار (الفصل). ئەو جیاکەرەوەیە بەوە دەناسرێ کە (هەمەکی)یە و دەبێتە گوتەزای شتێك لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا (ئەوە چییە لە خودی خۆیدا؟).

---

## راڤە

لە ڕابردوودا باسی جیاکار و بەشەکانی ئەومان کرد، گوتمان دەبێ بە دووبەشەوە (نزیك) و (دوور). ئەگەر هاوبەشییەکی تەواو نەبوو لەنێوان ئەم حەقیقەتە و حەقیقەتێکی تردا ئەوە (جیاکاری) هەیە، حەقیقەتەکە لە حەقیقەتی تر جیا دەکاتەوە بە جیاکردنەوەیەکی زاتی یان ئەوەتا هاوبەشێتی هەیە لە هەندێك شتدا ملیۆنان جۆری تر دەگرێتەوە ، واتە: بۆیەك حەقیقەت چەندان ڕەگەز هەیە، تاکەکانیان زۆرە و گیانداریش ڕەگەزی هەیە، بەخۆی هەمەکی ترە، ئەویش (جەستەی گەشەدار)ە واتە: (الجسم النامی) کە دەخوات و دەخواتەوە و گەشەدەکات و زاوزێ دەکات، مرۆڤ و گیاندار و ڕووەك لەم

حەقیقەتە بەشدارن. جەستەی گەشەداریش ڕەگەزێکە ئەویش (لەش)ە و گەشە دەکات، ئەو تەنەی گەشەناکات بێ گیانە (الجماد)ە، دواجار جەستەش ڕەگەزێکی هەیە ئەویش (جەوهەر)ە. ئەویش دەبێتە دوو بەش (دوور) و (نزیك). (نزیك) ئەو ڕەگەزەیە دەبێتە وەلامی (چیەتی) وەکو (گیاندار) لە بارەی مرۆڤ دا و هەر جۆرێکی تری هاوبەشدا. واتە: گیاندار دەبێتە وەڵامی ئەو پرسیارەی لە بارەی مرۆڤ و گیانداری وەکو ئەسپدا دەکرێت.

بەڵام مرۆڤ جۆری نزمە، گیاندار لە سەرووی مرۆڤەوە دێ، ئینجا لەشی گەشەدار، دوایی جەستە دێ ئینجا گەوهەر دێ.

گیاندار ڕەگەزی نزیکە بۆ مرۆڤ، بەڵام جەستەی گەشەدار (الجسم النامی) چونکە نێوانی لەگەڵ مرۆڤدا هەیە و ڕاستەوخۆ بەسەر مرۆڤدا دابەش نابێت بۆیە بە (ڕەگەزی دوور) ناسراوە، بەڵام جەستەی گەشەدار بۆ (لەش) ڕەگەزی نزیکە و بۆ مرۆڤ و گیانداران بە ڕەگەزی دوور دادەنرێت.

﴿ مرۆڤ – گیاندار – جەستەی گەشەدار – لەش – جەوهەر ﴾ ڕەگەزی نزیك (القریب) ئەو ڕەگەزەیە ڕاستەوخۆ دابەش ببێ بۆ ئەو جۆرە وەکو گیاندار بۆ مرۆڤ و غەیری مرۆڤ. بەڵام جەستەی گەشەدار و جەستە و جەوهەر لەبارەی مرۆڤەوە ڕەگەزێکی دوورن. بەڵام جەوهەر کە دواترینیانە ڕەگەزی باڵایە. لەسەر ئەم پێوەرە بە ڕەگەزە دوورەکان دەڵێن: ڕەگەزی باڵا (الجنس العالی)، نزمترین (ڕەگەز) ڕەگەزی خوارووە وەکو (گیاندار)، ڕەگەزی مام ناوەند (الجنس المتوسط) لەو نێوانەدا (لەشی گەشەدارە) ، گەر جیاکارییەك هەبوو

لەنێوان ئەم حەقیقەتە و حەقیقەتێکی تردا ئەوە (جیاکارە) و وەکو (قسەکەرە) بۆ مرۆڤ.

**********

## مەبەست لە گوتەزا (المقولة)

وەکو باسکرا (المقولـة) بریتییە لە هەڵگیراوێك (المحمول) ، لەبەر ئەوە پێی دەگوترێ (المحمـول) چونکە هەڵگیراوەکـە لـە (القضـية) دا گوتەزایەکـە لەسـەر بابەتەکە.

(المقولات) واتە: گوتەزاکان کە بریتین لەو توخمـە بەرزانـەی دەوری هـەموو بونەوەرەکانیان (الموجودات) داوە، یان بریتین لـەو هەڵگیراوانـەی کـە دەگونجێ بدرێنە پاڵ هەموو بابەتێك، ژمارەیان لای ئەرستۆ دەگوتەزایە: کە بـە (مقـولات ارسطو) ناسراون:

(جەوهـەر و سـەرباره و چـەندییەتی و چـۆنیەتی و شـوێن و کـوێ؟ کـات (کەی)؟ دانان و موڵك و کردار و هەڵچوون).

لەلای (کانت) ئەو وێنا گشتی یە بنەڕەتانەن عەقڵی ڕووت لەخۆیان دەگـرن، کە بریتین لە چەند وێنەیەکی پێش وەختەی مەعریفە، لە سروشتی حوکمەکـە هەڵدەرێنجرێن لـە جۆرەهـا وێنـەی دا، دەبنـە پێکهێنـەری لایەنـە بنەڕەتـەکانی بیرکردنەوەی تیۆری یان بەڵگە هێنانەوە (الاستدلالی) کە دەبن بە چوار ڕەگەزی

گەورە: چەند (کم) و چۆن (کیف) و سەرباره (الاضافة) و لایەن (الجهة) ، هەرکام لەوانە سێ بەشیان هەیە، بەهەموویان دەبنە ١٢ گوتەزا یان کاتوگوری (Category). لای زانایان گوتەزا ئەو وێنا گشتییانەن، عەقڵ ڕادێنن کە ئەحکام و بیرەکانی بۆ بگێرێتەوە.

## وێنەی گوتەزاکان لای (کانت)

| چەندیەتی (الکم) | چۆن (الکیف) | سەرباره (الاضافة) | لایەن ( الجهة ) |
|---|---|---|---|
| - یەکێتی (الوحدة).<br>- زۆری (الکثرة).<br>- سەرەنجام (الاجمال). | - ئەریْ (الایجاب).<br>- نەریْ (السلب).<br>- دیاریکردن (التحدید). | ١- پەیوەندی نێوان جەوهەر و ڕواڵەت.<br>٢- پەیوەندی نێوان هۆکار و هۆگر (العلة و المعلول).<br>٣- هاوبەش (کاریگەری نێوان بکەر و کارتێکراو). | - گونجان (الامکان) و نەگونجان (الامتناع).<br>- بوون (الوجود) و نەبوون (اللاوجود)، پێویستی (الضرورة) و دروست (الجواز). |

پرۆفیسۆر (د.موستەفا زەڵمی) کە یەکێکە لە موجتەهیدە هاوچەرخەکانی کورد و جیهانی ئیسلامی دەنووسێ:

گوتەزاکانی ئەرستۆ (١٠) گوتەزایە، کە تەواوی گەردوون بەسەر یەکێ لەم (١٠) گوتەزایانەدا پلە پلە دەبێت، یان ئەوەتا جەوهەر دەبێ یان دیاردە دەبێت.

پوختەی ئەو گوتەزایانە لێرەدا دەخەینە ڕوو:

١. جەوهەر (هیولی): ئەو شتانە لە گەردووندا دەگرێتەوە کە بەخۆیان بە چالاکی خۆیان هەڵدەستن و پشت بە بوونەوەری تر نابەستن، لە بەرامبەر جەوهەردا (دیاردە) هەیە، کە لە یاساکاندا بە ئەعیان ناسراون. ئیبن سینا دەڵێ: جەوهەر ئەو شتانەیە بەخۆی لە ئارادایە لە بابەتێکدا.

ئەگەر جەوهەر شوێنێك بێ بۆ جەوهەرێکی تر بە (هیولی) ناسراوە، گەر لە جەوهەرێکی تر حاڵەت بێ ئەوە بە (وێنە) دەناسرێت.

٢ — ٣. (الفعل — الانفعال)ە:

کردار (الفعل) واتە: کارکردن لە شتێك کە توانای قبوڵکردنی هەبێت. (الانفعال) واتە: شتێك بەهۆی شتێکی تر کاری تێبکرێ. (الانفعال) واتە: کارتێکران و هەڵچوون، ئەو بارودۆخەی بەسەریان دێ بە شوێنەوار ناودەبرێ، وەکو گەرم کردن (التسخین) و گەرم بوون ( التسخن ) تا ئەو بمێنێتەوە ئەویش دەمێنێتەوە.

٤ – ٥. چۆن (الكیف) و چەند (الكم):

(كیف) لەزاراوەی لۆژیكی دا واتە: ئەرێنی لە گوتەی ئەرێنی (القضیة الموجبة)دا، وەكو: (كل انسان قابل للتعلم) واتە: هەموو مرۆڤێك ئامادەیی فێربوونی هەیە، یان نەرێنی یە وەكو (لا التزام لمن لا ایمان له) واتە: ئەوەی بڕوای نەبێ پاپەند بوونی نیە.

بەڵام چەندی (الكم) لە زاراوەی لۆژیكی دا ئامرازێكە بۆ بەیانكردنی ئاستی شمولیەتی هەڵگیراوەكە (المحمول) لە گوتە (القضیة) دا بۆ تاكەكانی بابەتەكەی.

كاتێ حوكمەكە تەواوی تاكەكانی بابەتەكەی گرتەوە قەزیەكە (القضیة) هەمەكی دەبێت، وەكو: (كل انسان مات) واتە: هەموو مرۆڤێك دەمرێت.

گەر حوكمەكە هەندێ لەتاكەكانی گرتەوە ئەو كاتە قەزیەكە هەندەكی (الجزئی) دەبێ وەكو: (بعض الناس فلاسفة). واتە: هەندێ خەڵكی فەیلەسوفن.

٦ – ٧. (این – لەكوێ؟) و (متی – كەی؟):

لە زاراوەی فەلسەفی دا لەكوێ (أین) دۆخێكە بۆ شتێك دەرەخسێت بەهۆی پەیدابوونی لە شوێنێكدا و چەند بەشێكی هەیە.

هەرچی كەی (متی)یە لەزاراوەی فەلسەفی دا دۆخێكە دێتە ئاراوە بەهۆی پەیدابوونەوە لە كاتدا.

٨ – ٩ – ١٠. (سەرباره – الاضافة) و (حاڵەت و شێوە – الوضع) و (خاوەندارێتی – الملك):

- سەرباره: حاڵەتێکە تووشی جەوهەر دێ، چونکە شتێکی تر لەبەرامبەریدا هەیە، بە قیاس نەبێ نازانرێ، وەکو گورێتی و باوکێتی.
- حاڵەت : شێوەیەکە تووشی تەن دەبێ، بەهۆی ئەوەی بەشەکانی دەدرێنە پاڵ یەکتری، بە مۆرك و بە نزیکی و بە دووری و تەریبی، یان بەهۆی دانەپاڵی ئەو بەشانە بۆ چەند کارێکی دەرەوەی ئەو ، وەك هەڵسان و دانیشتن.
- خاوەندارێتی : شێوەیەکە تووشی شتێك دێ بە نیسبەت ئەو شتەی دەوری داوە و لە ڕێگەی ئەوەوە دەگوازرێتەوە، وەکو ئەو پۆشاکەی مرۆڤ لەبەری دەکات.

لەم چاخەدا موڵك بەو شتانە دەگوترێ مرۆڤ خاوەنیانە و بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوتنیان تێدادەکات و بەکاریان دێنێ و دەیانگوازێتەوە و شوێنگۆڕکێیان پێ دەکات[39].

نموونە: (جەوهەر) وەکو سوکرات، بڕێتی وەکو (پێنج بست، پێنج مەتر) چۆنیەتی (الکیفیە) وەکو: ڕەنگ گەنمی و ئەسمەر. سەرباره (الاضافە) وەکو چارەك (الربع)، شوێن (المکان) وەکو یاریگا، کات (الزمان) وەکو: ڕۆژ. حاڵەت و شێوە (الوضع) وەکو دانیشتن، موڵك (الملك) وەکو: هەڵگری چەك، کردار (الفعل) وەکو پاراستن (الحفظ)، کارتێکران (الانفعال) وەکو پارێزراو (المحفوظ).

[39] بەکورت کردنەوە لە کتێبی (فلسفة المسؤليات القانونية في ضوء مقولات الارسطية/ أ.د.مصطفى زلمي/ ص ٣٢ ــ ٣٩) و (الشرح الکبیر / ابو الفرج عبدالله بن طیب البغدادي) وەرگیراوە .

لای ئەفلاتوونیش مانای جەوهەر و چۆن و چی و سەرباره و کردار و کارتێکراو کراوە، بەلاَم وەکو ئەرستۆ ڕوونی نەکردوونەوە و پێکەوە گرێی نەداون و بۆ یەك سیستەمی نەگێڕاونەوە.

بۆ زانستی پتر بڕوانە (دراسات في فلسفة اليونانية/حسين صالح حمادة/ج١/ص ٣٥ – ٣٧).

وە ئەرستۆ لە کتێبی (ئەتولۆژیا)دا پێی وایە (جەوهەر) دەبێ بە سێ بەشەوە، دوویان سروشتین و یەکێکیشیان ناجوڵێن. پێویستە هەموو بزۆکێك جووڵێنەرێکی هەبێ، بەلاَم خودا کە بوونی پێویستە سوودی لە بوونی شتی ترەوە وەرنەگرتووە بەلاَم هەموو شتێ بە کردار سوودی لێ وەرگرتووە.

وەخودا کە بوونی پێویستە بزۆکی شتەکانە، گۆڕانی بەسەردا نایەت بەخۆی زیندووە و دەمێنێتەوە، ئەو بزۆکی سەرەتایە، ئەو بزۆکە سروشتییانە هیولی و وێنەیە، واتە: (الجوهر) و (الاعراض) کە پڕەنسیپی تەنە سروشتییەکانن. بۆ زانستی پتر بڕوانە (الملل و البخل/ الشهرستانی / ص ٢٦٨ – ٢٧٠).

عەللامەی ئیسلام النووی – رحمه الله – لە (شرح المقاصد)دا دەفەرموێ: وجود و بوون بۆ خوای گەورە پێویستە واجبە ئەو ئەزەلی و ئەبەدی بێت وە خودای بێگەرد نە جەوهەر و نە دیاردەیە.

خودا هیچ ڕووێکی نیە، لە هیچ جێگایەك جێگیر نەبووە، ئەو لەزات و کردار و سیفات دا تاك و تەنیایە[٤٠].

[٤٠] شرح المقاصد للنووي/شرحها محمد الحجاز/دار البشائر الاسلامية/ ص ٢٢/ط٢/٢٠١٠/ بيروت – لبنان.

واتە خودا قیاس ناکرێ لەگەڵ بوونەوەردا ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى: ١١.

زانایەکی ناوداری خۆرئاوای هاوچەرخ (بۆل کلارنس ئەبرسۆلد) مامۆستای سروشتی زیندەگی لە ئەمریکا دەنووسێ " ئایا خودا وجودێکی زاتی هەیە وەکو زۆر کەس ئەو بڕوایەیان هەڵگرتووە؟ لەڕووی زانستییەوە ناتوانم خودا بە شێوەیەکی ماددی وێنا بکەم کە چاوەکان بیبینن، یان لەشوێنێك بێ و لە شوێنێك نەبێ، یان لەسەر کورسی و عەرش دانیشتبێت" [41].

قورئان دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعام: ١٠٣. واتە: چاوەکان خوا نابینن، ئەو چاوەکان پەی پێ دەبات.

قورئان دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ ﴿٣﴾ ﴾ الحديد: ٣. واتە: خوا سەرەتایە و کۆتاییە، ئەزەلییە و ئەبەدییە و بڕانەوەی نییە. ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ ﴿٤﴾ ﴾ الحديد: ٤. واتە: لەهەر کوێیەك بن خوا لەگەڵ ئێوەدایە.

کەواتە: ئایین و زانست و فەلسەفە و لۆژیك و زانستی کەلام کۆکن لەسەر ئەوەی کە خودا نە جەوهەرە و نە دیاردەیە، بەڵکو ئەو دروستکەری جەوهەر و

[41] الله يتجلى في عصر العلم/جون كلفر مونسما/ ص ٣٧.

دیاردەکانە و ئەزەلی و ئەبەدییە بێ جێگا و مەکانە، زەمان و مەکان نایگرێتەوە و دروستکەری ئەوانەیە، دیسان نووسەر دەڵێ :

﴿(١) وأما عرضي: فاما ان يمتنع انفكاكه عن (الماهية) وهو (العرض اللازم). (٢) اولا يمتنع وهو (العرض المفارق) وكل واحد منهما: اما ان يختص بحقيقة واحدة وهي خاصة (كالضاحك بالقوة و بالفعل) بالنسبة و ترسم بانها كلية تقال على ما تحته حقيقة واحدة فقط قولا (عرضيا) واما ان يعم حقائق فوق واحدة و هو (العرض العام): كا (المتنفس) بالقوة و بالفعل بالنسبة الى الانسان و غيره من الحيوانات، ويرسم بانه كلي، يقال على ما تحته حقائق مختلفة قولا عرضيا﴾.

---

واتــه : (١) بــەڵام (ڕواڵــەتی هەمــەکی) ئەمەیــە لــە (چــییەتی) خــۆی جیانابێتــەوە، بــەم جــۆرە ڕواڵەتــە دەگــوترێ ڕواڵــەتی پێــوە نووســاو (العــرض اللازم). (٢) یان ئەوەتا (ڕواڵەتی هەمەکی) لە (چییەتی خۆی) جیا دەبێتەوە وە ئــەوە پێــی دەگــوترێ (ڕواڵــەتی پێــوە نوســاو (العــرض المفــارق) ) هــەرکام لــەم دووانە: یان تایبەت دەبێ بە یەك حەقیقەتەوە کە بریتییە لە ڕوالەتی تایبــەتی (العرض الخاص) وەکو (پێکەنین) بۆ مرۆڤ بە (توانا) و (کردارەوە). بەو واتایــە دادەنرێ کە (هەمەکی)یە و دەبێتە گوتەی یەك حەقیقەتی ڕواڵەتی.

یاخود ئەو (ڕواڵەتە) دەبێتە گوتەی پتر لە حەقیقەتێك کە ڕواڵــەتی گشــتی (العــرض العــام)ە، وەکــو (هەناســەدان) بــە هێــز و کــردارەوە بــۆ مــرۆڤ و

گیاندارانیش. بە (هەمەکی) سەیر دەکرێ، دەبێتە گوتەیەکی ڕواڵەتی بۆچەند حەقیقەتێکی جۆراوجۆر.

---

## ڕاڤە

ڕابردوو ئامەژەمان بە ڕواڵەت (العرض) کرد، گوتمان پێنج هەمەکییەکان دەبنە دوو بەشەوە: (خودی) وەکو (مرۆڤ) و (ڕواڵەتی) وەکو (پێکەنین).

ڕواڵەتی سیفەتێکە و دیاردەیە، تایبەتە بەیەك حەقیقەتەوە وەکو (پێکەنین) ئەمەیان بەشی یەکەمی ڕواڵەتە بەناوی ڕواڵەتی تایبەتی (العرض الخاص) بەلاّم (ڕواڵەتی گشتی – العرض العام) کە بەشی دووەمی ڕواڵەت (العرض)ە و دەبێتە وەسف بۆ جۆرەهای جیاواز، وەکو (ڕۆیشتن) کە دەبێتە ڕواڵەت بۆ مرۆڤ و گیاندارانیش وەکو (ئەسپ) و (شێر) و (فیل) تێیدا بەشدارن. یان (هەناسەدان) کە مرۆڤ و گیانداران ئەنجامی دەدەن و هاوبەشن تێیدا ئەمانە دەبنە گوتەیەکی ڕواڵەتی بۆ چەند حەقیقەتێکی جۆراوجۆر.

مەبەست لە (القوة) واتە: ئەم دیاردەیە وەکو سیفەتێکی سروشتی لە مرۆڤدا هەبێ، یان بە کردار. (پێکەنین) هەموو کاتێك لە مرۆڤدا نییە بۆیە بە دیاردە ناسراوە. لەبەر ئەوە لای لۆژیکییەکان ڕواڵەت دووبەشە: گەر پێکەنین لە مرۆڤدا دیارنەبوو پێی دەگوترێ ڕواڵەتی پێوە نەنوساو یان جیا (العرض المفارق) گەر لە مرۆڤدا دەرکەوت پێی دەگوترێ ڕواڵەتی نووساو (العرض اللازم) واتە: لەو دۆخە بەکردەوە بە مرۆڤەوە نووساوە.

(القوه) و (الفعل) لێرەدا ئاماژەیە بۆ دۆخی سروشتی و کردەوەیی. واتە: گەر لە ماهییەت و چییەتی جیابۆوە ئەوە (ڕواڵەتی نووساو)ە، گەرنا ئەوە (ڕواڵەتی نەنوساو)ە، (نوساو) هەندێ جار بە بوونی دەرەکییەوە لکاوە، وەکو ڕەش پێستی بۆ (تاکی حەبەشی)، یان (لکاوێکی زەینی)یە وە نوساوە وەکو جوتانەیی بۆ (چوار)، یان تاقانەیی بۆ (سێ) ، (ڕواڵەتی نەنوساو) جار هەیە بەردەوامە، وەکو (هەژاریی درێژ خایەن) کە دەتوانێ دەوڵەمەند ببێت، یان زوو دەڕوات و دیار نامینێت، وەکو سووربوونەوە لەکاتی تەریق بوونەوەدا، یان زەرد هەڵگەڕان لەکاتی ترسدا، یان بە هێواشی دەڕوات وەکو (پیری) و (لاوی).

## چوار دانە پاڵەکان (النسب الأربع)

گەر واتایەك درایە پاڵ واتایەکی تر گۆڕانی بەسەردا دێنێت ، مەبەست (النسبة) واتە : لە نێوان دوو هەمەکی دا لە بواری پڕاو پڕی مانای هەر کام لەوانە بۆ ئەوی تریان لە پەلگەی سەلماودا .

نمونە : دانەپاڵی نێوان باڵندە (الطائر) و گیاندار (الحیوان) دا بەم شێوەیە دەبێ : گیاندار پڕاو پڕی واتای باڵندە دەبەخشێت لە بەڵگەی بەڕاست دانراودا ، بەلاّم باڵندە بەشێکی گیانداران دەگرێتەوە لە بەڵگەی بەڕاست دانراو (المصدق)دا

لێرەدا چوار کەڵی لێ دەبێتەوە :

١) یەکسانی (التساوي) : ئەمە لە نێوان دوو چەمکی هاوبەشدا ڕوودەدات لە تەواوی تاکەکانی دا بەشداری دەکات ، وەکو (مرۆڤ) و (پێکەنین) . واتە :

هەموو مرۆڤێك بە پێكەنینەو هەموو بە پێكەنینێك مرۆڤە ، نیشانەی یەكسانە (=) .

٢) دانەپاڵی گشتی (نسبة العموم) و دانەپاڵی تایبەتی (نسبة الخصوص) بەڕەهایی :

لەنێوان دوو چەمكدا ڕوودەدات چەمكێكیان دەبێت بە بەڵگەیەكی بڕواپێكراو بۆ تەواوی ئەو چەمكانەی دەبێتە بەڵگەیەكی بڕوا پێ كراو بەسەریانەوە ، چەمكی تریش دەگرێتەوە ، وەكو : (گیاندار) و (مرۆڤ) و (كانزا) و (زیو) . بە (گیاندار) دەگوترێ گشتی بە ڕەهایی ، بە مرۆڤ دەگوترێ تایبەت بە ڕەهایی ، كانزاش گشتییە ، زیو تایبەتی یە ، زیو بەشێكە لە كانزا.

نیشانەی گشتی و تایبەتی بە ڕەهایی : گشتی بە ڕەها > ، تایبەت بە ڕەهایی < .

٣) دانەپاڵی گشتی و تایبەتی لە یەك لانەوە ، لەنێوان دوو چەمكدا ڕوودەدات ، كە لە هەندێ بەڵگەی سەلێنەردا بەشدار دەبن ، لە هەندێكی تردا جیاواز دەبنەوە ، واتە : لەو بەڵگە بەڕاست دانراوانەدا جیا دەبنەوە تایبەت دەبێ بەخۆیان.

وەكو (باڵندە) و (ڕەش) ، ئەم دووانە لە قەڵە ڕەشدا (الغراب) كۆدەبنەوە ، بەڵام لە كۆتر (الحمام) جیا دەبێتەوە ، چونكە قەڵەڕەش ڕەشەو كۆتر سپییە.

نیشانەی گشتی و تایبەتی لە یەك لایەنەوە : ×

٤) دانەپاڵی جیا (نسبة التباین) : لەنێوان دوو چەمكدا ڕوودەدات ، كە لە هیچ كام تاكەكاندا لەو تاكانە كۆنابێتەوە وەكو مرۆڤ و بەرد (الحجر) .

نیشانەی جیاوازی : // .

## مەبەستەکانی وێناکان (مقاصدات التصورات)

## قسەی ڕاڤەکار (القول الشارح)

---

١) (الحد) : قول دال على ماهية الشيء ، وهو الذي يتركب من جنس الشيء وفصله القريبين كالحيوان الناطق بالنسبة الى الانسان وهو (الحد التام) .

٢) والحد الناقص : وهو الذي يتركب من جنس الشيء البعيد وفصله القريب كالجسم الناطق بالنسبة الى الانسان.

٣) والرسم التام : وهو الذي يتركب من جنس الشيء القريب وخواصة اللازمة كالحيوان الضاحك في تعريف الانسان.

٤) والرسم الناقص : وهو الذي يتركب من عرضيات تختص جملتها بحقيقة واحدة ، كقولنا في تعريف الانسان : انه ماشي على قدمية عريض الاظفار ، بادي البشرة مستقيم القامة ، ضحاك ، بالطبع.

---

واتە : پێناسە (الحد) : گوتەیەکە (چییەتی) شتێك پیشان دەدات .

١) پێناسەی تەواو (الحد التام) : پێك دێت لە ڕەگەزی شتێك و جیاکاری نزیك ، نموونەی : گیانداری قسەکەر (الحيوان الناطق) لەبەرامبەر (مرۆڤ)دا.

٢) پێناسەی ناتەواو (الحد الناقص) : پێکدێت لە (ڕەگەزی دوو)ی شتێك و (جیاکاری نزیك) .

وەکو : (لەشی قسەکەر) لەبەرامبەر (مرۆڤ)دا .

٣) ناسینی تەواو (الرسم التام) : پێکدێت لەڕەگەزێکی نزیکی شتە ناسراوەکە و ئەو (تایبەتکارییە)ی (پێوەری نووساوە) وەکو : (گیانداری بە پێکەنین) بۆ ناسینی (مرۆڤ) .

٤) ناسینی تەواو (الرسم الناقص) : لە چەند دیاردەیەك پێکدێت کە بە گشتی تایبەت دەبن بە یەك حەقیقەت و ڕاستییەوە وەکو لە ناسینی مرۆڤدا دەڵێین : ئەو لەسەر دوو قاچ دەڕوات ، نینۆکی پانە ، پێستەکی ڕوونی هەیە ، لەسەر بالآی وەستاوە ، بە سروشت بە پێکەنینە .

---

## ڕاڤە

## ( پێناسە – التعريف – الحد )

(الحمد) : واتە : (التعریف) ، کە بریتییە لە ڕوونکردنەوەی حەقیقەتی شتێك و ڕونکردنەوەی واتایەکەی .

## بەشەکانی پێناسە

١. پێناسەی تەواو (الحد التام) : بریتییە لە پێناسەی (ڕەگەز) و (جیاکار)ی نزیك لە یەکتریەوە. وەکو :




٢. پێناسەی نا تەواو (الحد الناقص) : پێناسەی (ڕەگەزێکی دوور) و (جیاکارێکی نزیك)ە ، یان تەنیا بە (جیاکار) دەبێت.

نموونە :




٣. ناساندنی تەواو (الرسم التام) : ناساندنی ڕەگەزو تایبەتمەندییە (الجنس و الخاصة). وەکو :



بە شێکی تر لە ناساندنی تەواو بریتییە لە (ناساندن بە نموونە – المثال) کە بریتییە لە ناساندنی بەڵگەی بەڕاست دانراو (مصداق) یەکێ لە بەڵگەکانی سەلماندنی شتێکی پێناسەکراو وەکو ئێمە دەڵێین : مرۆڤ وەکو : محمد و علی و عبدالله .

٤. ناساندنی ناتەواو (الرسم الناقص) : پێناسەی تایبەتمەندییە و بەس ، وەکو (مرۆڤ بە پێکەنینە) بەشێکی تری (ناساندنی ناتەواو) نایاندن بە لێکچواندن (التشبية) کە باسی شتێك دەکەی بە شتێکی ناسراو دەچێت ، وەکو ﴿الكليات متبيان : كالخطين المتوازيين﴾ ئەم دوو کوللی یە جیاوازە وەکو دوو هێڵی تەریبن .

بەشێکی تری (پێناسەی ناتەواو) ناساندنە بە بەش (القسمة) ، واتە : ناساندن بە بەشەکانی شتێکی ناسێنراو ، وەکو : ناو و کردارو پیت.

دیسان پێویستە کۆمەڵە مەرجێك ڕەچاو بکرێ بۆ دامەزراندنی پێناسەیەکی ساغ و دروست ، دەبێ مەرجەکانی پێناسەی زانستی وەربگرێت.

١) دەبێ پێناسەکە لەگەڵ پێناسە کراوەکە یەکسان بێت لە ڕاستی و پێکاو پێکی دا لە تاکەکاندا ، بۆ نموونە : گەر بڵێی : (مرۆڤ گیاندارە) ئەمە پێناسەیەکی زانستی نییە ، بەلأم گەر بڵێی مرۆڤ گیاندارێکی قسەکارە ئەوا پێناسەیەکی زانستییە چونکە گیاندار لە مرۆڤ گشتیی ترە .

٢) پێناسەکە چەمکێکی ڕۆشنبیرو زانراو تری هەبێ لە پێناسەکراوەکە ، پێناسەی (تاك) بەم شێوەیە بڵێین : لە دوو دانە یەکێکی کەمترە ، ئەمە پێناسەیەکی زانستی نیە .

٣) دەبێ پێناسەکە وەکو پێناسەکراوەکە بێ ، وەکو پێناسەی (ئادەمیزاد) کە مرۆڤە ، هەر چەندە ئەم پێناسەیە ڕاستە لە دەربڕینندا ، بەڵام پێناسەیەکی زانستی نییە .

٤) ناگونجێ پێناسە بە شتێك بکرێ ناسینەکەی لەسەر ناسینی هەمان شتی پێناسەکراو بوەستێت ، وەکو : (خۆر ئەستێرەیەکە لە ڕۆژدا دەبینرێ) لە کاتێکدا دەبینین کە ناسینی ڕۆژ لەسەر ناسینی خۆر دەوەستێت ، چونکە ڕۆژ ئەو کاتەیە خۆری تێدا دەردەکەوێت.

٥) دەبێ پێناسەکە بە وشەی ڕۆشن و بێ پێچ و پەنا بکرێت و شاراوەیی تێدا نەبێ

## دابەشکردن ( التقسیم ) و پۆلێن کردن ( التصنیف )

١) دابەشکردن : بریتییە لە بەش کردنی شتێك بۆ جۆرەکانی ، یان شی کردنەوەیان بۆ توخمەکانی ، واتە : گەر گوتمان : وشە لە سێ بەش پێك دێ : ناو (الاسم) ، کردار (الفعل) ، پیت (الحرف) ئەو کاتە ئێمە وشەمان دابەش کردووە بۆ سێ جۆرەکانی .

گەر گوتمان (ئاو) بۆ دوو توخم شی دەبێتەوە ، (ئۆکسجین) و (هایدرۆجین) ، واتە : ئێمە ئاومان بۆ دوو توخمە پێکهێنەرەکانی شی کردۆتەوە ، ئەو بەش کردن و شی کردنەوەیە بریتییە لە (دابەشکردن).

بۆ ئەوەی دابەش کردنەکە بە سوود بێ پێویستە بنەمایەکی هەبێ لەسەری دابمەزرێ ، بۆ نموونە : گەر گیاندارانمان بەش کرد بۆ گۆشت خۆرەکان و گیا خۆرەکان ، ئەوکاتە بنەماکە لەسەر جۆری خواردن بەش کراوە .

بەشکردن دوو بەشی هەیە :

١- بەشـکردنی سروشـتی : وەکـو شـی کردنـەوەی ئـاو بـۆ تـوخمی ئۆکسـجین و هایدرۆجین.

٢- بەشـکردنی لـۆژیکی : وەکـو بەشـکردنی وشـە بـۆ نـاو و کـردارو پیـت ، ئـەم بەشکردنە بریتییە لە شی کردنەوەی شتێك بـۆ بەشـەکانی ، کـە بەسـەریدا جێ بەجێ دەبێ ، بێگومان بەش کردن زۆر گرنگە ، گەر بەشکردن نەبوایـە زنجیرەبەنـدی شـتەکان و پرەنسیپی ئـەو شـتانەمان نـەدەزانی ، نموونـەمان دابەشکردنی سروشتییە لـە (گیانلەبـەرزانی) دا ، بـۆ نموونـە : بـەو پێـوەرە دەزانـین لقـی شـێر لـە پـۆلی شـیردەرەکانە ، شـیر دەرەکـان لـە بەشـی بڕبڕەدارەکانن.

٢) پۆلین کردن (التصنيف) : دانـانی تاکەکانـە لـە چـەند کۆمەڵەیـەکی جیـاوازدا لەسەر بناغەیەکی تایبەتی ، بۆ نمونە : گەر کتێبخانەیەکمان هەبێ بمانـەوێ کتێبەکان دانە دانە جیابکەینەوەو بەپێ ی بابەتە زانستییەکان دایـانبنێین : بۆ نمونـە : کتێبـە کۆمەلأیەتییـەکان بـەجیا ، کتێبـە سروشـتییەکان بـەجیا ، کتێبە ئەدەبی و مێژووییەکان بەجیا ، کتێبـە فەرهەنگییـەکان بـەجیا ، هـەر کـام لەوانــە لــە کۆمەڵــەی خۆیانــدا ڕیزمــان کــردن ، لێــرەدا دەڵــێین : کتێبخانەکەمان پۆلێن کردووە .

دەتوانین گیانداران بەو ڕێسایە پۆلێن بکەین بۆ نمونە : بۆ کۆمەڵەی کۆن و تازە دابەش دەبن .

یان دەبینین لە جیهانی ئـەمڕۆدا گیانـداران بەسـەر پێـنج جیهانـدا دابـەش کراون :

١- جیهانی سەرەتایی ، نموونەی بەکتریا.

٢- جیهانی پێشەنگەکان ، نموونەی پارامیسیۆم .

٣- جیهانی ڕووەك ، نموونەی قەوزەو ڕووەکی تاك خانەیی .

٤- جیهانی کەڕوو ، نموونەی قارچك .

٥- جیهانی گیانداران ، نموونەی گیاندارە بالاَکان وەکو مرۆڤ .

**پۆلێن کردن دوو جۆرە :**

١- پۆلێنی زانستی : کە بە ڕێکی و سیستەمێکی جوان ڕیز دەکرێن و دادەنرێن ، وەکو دانانی کتێب لە کتێبخانە لەسەر بنەمای بابەتەکان.

٢- پۆلێنی نازانستی : پشت بە ڕواڵەتی دەرەوە دەبەستێ وەکو دانانی کتێبی بەپێ ی قەبارە ، بێگومان پۆلێن کردن لە ژیانی زانستی دا زۆر گرنگە ، لەوە ڕۆشنترە ئاماژەی پێ بکەین .[٤٢]

## بەڵگە هێنانەوە (بەڵگەکان) (الاستدلال)

(الاستدلال – الحجة) واتە : بەڵگە ، کە بەرزترین ئامانجی لۆژیکە ، کە مەبەست لێکۆڵینەوەی سەلماوەکانە بۆ گەیشتن بە مەعریفەی نەزانراوی سەلمێنراوەکە .

(بەڵگە) لە (لۆژیك)دا بریتییە لە (القضیة) کە پێی دەگاتە ئەو شتەی مەبەستییەتی بەدەستی بێنێت ، پێی دەگوترێ (الحجة) ، چونکە دیکاتە بەڵگەو

[٤٢٤٢] بۆ نموونە قورئانی پیرۆز لە ڕاست گرنگی پۆلێن کردنی گیانداران فەرموویەتی : (والله خلق كل دابة من ماء فمنهم من يمشي على بطنه ومنهم من يمشي على رجلين ومنهم من يمشي على أربع يخلق الله مايشاء) (النور ٤٥) لێرەدا قورئان پۆلێنی گیانداران ئاماژە پێدەکات ، وەکو : خشۆك ، دوو پێیەکان ، چوار پێیەکان ، و ژیانی سەرەتایی لە ناو دروست بووە .

نیشانە لە بەرامبەر نەیاردا بۆ سەلماندنی مەبەستەکەی پێی دەگوترێ (الادلة) ، چونکە مەبەستەکە پیشان دەدات ، ئامادەی دەکات و پێکی دێنێ بۆ ڕێ نیشاندان ، بۆیە پێی دەگوترێ (الاستدلال) واتە : (بەلگە هێنانەوە) ، کە بریتییە لە هێنانەوەی بەلگە بۆ سەلماندنی مەبەست ، ئەم چەمکە بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبێ :

أ. بەلگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ (الاستدلال غير مباشر) ئەویش سێ ڕێگەی هەیە :

١- (التناقض) لە یەك نەچوو (دژ بەیەك) .

٢- (العكس المستوی) پێچەوانەی ئاست.

٣- (عكس النقيض) پێچەوانەی دژ (دژە پێچەوانە) .

ب. بەلگە هێنانەوەی ڕاستەوخۆ : (الاستدلال المباشر) : ئەویش سێ ڕێگەی هەیە .

١- (القياس) : پێك گرتن (پێواندن) پێوانە .

٢- (الاستقراء) : لێکۆلینەوەو هەلسەنگاندن ، تێگەران.

٣- (التمثيل) : پێ چواندن .

بە کورتی (الاستدلال) : لای لۆژیکییەکان واتە : (النظر في الدليل) واتە : سەیرکردنی بەلگە ، بەلگە هێنانەوە بریتیە لە هێلنجانی (الاستنباط) ی گوتەیێك (القضية) لە هەوالێك یان چەند هەوالێك ، یان بەدەست هێنانی بڕوا پێ کردن (التصديق)ە بەهۆی حوکمێکی نوێ ی جیاواز لە ئەحکامەکانی ڕابردوو کە پێوەی پەیوەست بوون ، ئەو مەعریفەیە لە زەیندا بە ڕێگای

(بەڵگە هێنانـەوە) پەیـدا دەبـێ ، ئـەوە (مەعریفەیـەکی ناڕاستـەوخۆ)یە ، بـەڵام ئەو مەعریفەیەی لـە زەینـدا بـەهۆی بـیر ڕوونـی (الحدس) پەیـدا دەبـێ ، ئـەوە مەعریفەیــەکی ڕاســتەوخۆیە ، بــە مەعریفــەی یەکــەم دەگــوترێ (معرفــة الاستدلالية) و بە مەعریفەی دووەم دەگوترێ (معرفة الحدسي) .

بەڵگەهێنانــەوەی فەلســەفی (الاســتدلال الفلســفي) دەکەوێتــە بەرامبــەر (الاستدلال الخطابي) (الجدلي) (السوفسطائي)[٤٣] .

*************************

٤٣ المعجم الفلسفي / د.جميل صليبا/ج١/ص٦٧-٦٩.

## پرەنسیپە بڕوا پێکراوەکان (مبادیء التصدیقات)

## گوتە (القضیة)

(القضیة) : قول یصح ان یقال لقائله : انه صادق فیه او کاذب فیه . وهي

١. اما حملیة : کقولنا : زید کاتب.
٢. وأما شرطیة متصلة : کقولنا :اذا کانت الشمس طالعة فالنهار موجود .
٣. واما الشرطیة منفصلة : کقولنا : العدد أما زوج أما فرد.

الجزء الاول من الحملیة : موضوعا

الجزء الثاني : محمولا.

الجزء الاول من الشرطیة یسمي : مقدما .

والجزء الثاني : تالیا.   والقضیة أما :

١. موجبة : کقولنا " زید کاتب"
٢. وأما سالبة : کقولنا " زید لیس بکاتب"

کل واحدة منها :

١. أما مخصوصة کما ذکرنا.
٢. أما محصورة.

وهي :

١. كليـة محصـورة : كقولنـا : "كـل انسـان كاتـب" و "بعـض انسـان لـيس بكاتب"

٢. واما ان لا يكـون كـذلك وتسـمى (مهملـة) : كقولنـا : (الانسـان كاتـب) و (الانسان ليس بكاتب).

والمتصلة :

١. أما لزومية : كقولنا : ان كان شمس طالعة فالنهار موجود.

٢. وأما اتفاقية : كقولنا : ان كان الانسان ناطق فالحمار ناهق.

والمنفصلة :

١. أما حقيقة : كقولنا : العدد اما زوج اما فرد ، وهي

أ- ما مانعة الجمع فقط ، كقولنا : هذا الشيء اما حجدا او شجر.

ب- ما مانعة الخلو فقط ، كقولنا : زيد اما ان يكون في البحر واما لا يغرق.

وقد تكون (المنفصلات) ذوات أجـزاء ، كقولنـا : (العـدد) : امـا زائـد او نـاقص او مساء.

---

واته :

(القضية — الخبر) واته : هەواڵ : گوتەیەکی هەواڵدەرە ، دەگونجێ بگوترێ هەواڵدەرکە ڕاست دەکات ، یان درۆ دەکات ، بە کوردی (هەواڵ) یـان (گوتـە) یـان (بڕیار)ی بۆ دانراوە.

ئەویش دوو بەشە :

١. گوتەی هەلگری (الحملية) وەکو : زەید نووسەرە ، زەید نووسەر نییە (یان زەید میرزایە ، زەید میرزا نییە).
٢. یان مەرجییەکی لکاوە (الشرطية المتصلة) : وەکو : ئەگەر خۆرهەلات ڕۆژ هەیە (یان گەر خۆرهەلات ڕۆژ پەیدا دەبێ).
٣. یان : مەرجییەکی نەلکاوە (الشرطية المنفصلة) : وەکو : ژمارە جووتانەیە یان تاکانەیە (ژمارە دووانەیە یان تاکانەیە) .

بەشی یەکەمی هەلگریی : بە بابەت (الموضوع) دەناسرێت.

بەشی دووەم : بە هەلگیراو (المحمول) دەناسرێت.

بەشی یەکەمی مەرجییە بە : (پێشەکی) دەناسرێت.

بەشی دووەمی مەرجییە بە : (پاشەکی) دەناسرێت.

هەوالی هەر گوتەیەك (ئەرێنی)یە : وەکو (زەید نووسەرە) یان (نەرێنی) یە : وەکو (زەید نووسەر نییە) هەر کام لەمانە (تایبەت)ە ، وەکو باسمان کرد ، یان قەتیس کراوەو بەستراوەتەوە (المحصورة) ئەویش یان (هەمەکی سنووردار)ە وەکو : (هەر مرۆڤێك نووسەرە ، هیچ مرۆڤێك نووسەر نییە).

یان هەندەکی سنووردارە وەکو : هەندێ مرۆڤ نووسەرە ، مرۆڤ نووسەر نییە ، یان بەو شێوەیە نییە ، ئەو کاتە بە بێ سنوور یان (المهملة) دەناسرێ ، وەکو : مرۆڤ نووسەرە ، مرۆڤ نووسەر نییە .

پاشان لکێنراوەکە (المتصلة) دوو بەشە :

١. پێوە نووساو (لزومية) : وەکو : گەر تاو هەڵات ڕۆژ هەیە.

٢. یان ڕێك کەوتنە (الاتفقاية) : وەکو : گەر مرۆڤ قسە کار بێ ، ئەو کەر بە زەرەیە.

مەرجی نەلکێنراو : یان حەقیقەتە وەکو : ژمارە جووتە یان تاکە . ئەو کاتە (ڕێگری کۆ – مانعة الجمع) و تیانەبوون (الخلو)ە پێکەوە ، یان بە تەنیا (ڕێگری کۆ)یە ، وەکو : ئەو شتە بەردە یان دارە ، یان ڕێگر تیابوونە (مانعة الخلو) ، وەکو : زەید لەناو دەریا دایە ناخنکێ.

هەندێ جاریش ئەو نەلکاوانە (المنفصلات) لە چەند بەشێك پێك دێن وەکو : ژمارە یان زیادەیە ، کەمە یان یەکسانە .

---

ڕاڤە :

## گوتەکان (بڕیارەکان – القضایا)

بەر لەوەی باسی ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوە ، بکەین پێویستە باسی (القضية) بکەین چونکە (القضية) ئەو کە ڕستەیەیە پەیکەری بەڵگە هێنانەوە پێك دەهێنێ.

(القضـية) واتـە : (الخـبر – هـەواڵ) گوتـە ، واتـە : (الحكـم – بڕیـار) : (د.عبـدالرحمن البـدوی) لـە (موسـوعة الفلسـفية)دا دەنووسـێ : (الاحكـام – ئەحکامەکان) بە (القضایا) گوزارش دەکرێ ، (القضية) ئەو گوتەیەیە ڕاستی و درۆ هەڵدەگرێ .

ئێمە بە گوتە لێکمان داوەتەوە ، لەبەر نەبوونی وشەیەکی گونجاوی کوردی لەبەرامبەر ئەم وشەیەدا .

بەشەکانی گوتە دەکرێتە دوو بەشەوە :

١. هەلگری (الحملية) : بڕیارێکە شتێکی تێدا دەسەلمێ بۆ شتێکی تر ، یان نەرێی شتێك دەکات لە شتێك ، نموونە (خالد حاضر) واتە : خالید ئامادەیە (طالب ليس بغائب) واتە : تالیب نادیار نیە .

ئەو هەواڵە هەلگرییەو سێ بناغەی هەیە :

أ- بڕیار لەسەر دراو : (هەلگیراو + الموضوع).

ب- بڕیار بێ دراو : (هەلگیراو – المحمول) .

ت- بڕیار : (دانەپاڵ – النسبة) .

لەم دوو نموونانەی ڕابردوودا :

بابەت (الموضوع) : (خالید – تالیب) ە .

هەلگرییە : (حاچر – ئامادە) و (غائب – نادیار)ە.

دانەپاڵ کە (النسبة) : سەلماندنی ئامادەبوونی (خالید)ە لە نموونەی یەکەمدا. لە نموونەی دووەم دا : نەرێنی غائیبی و نادیاری (تالیب) ڕەت دەکاتەوە .

٢. مەرجییە (الشرطية) :

مەرجییە : (ئەو بڕیارەیە دەدرێ بە بوونی (دانەپاڵ) لە نێوان دوو گوتە

(القضية)دا ، یان نەبوونی دانەپاڵ (النسبة) لە نێوانیاندا).

وەکو : ﴿اذا اشرقت الارض فالنهار موجود﴾ ﴿لیس کلما دق الجرس فقد حان وقت الدرس﴾.

بەشەکانی مەرجییە

١) پێشەکی (المقدمة) : وەك نموونەی یەکەم (کاتێك خۆر هەڵات) . نموونەی دووەم (زەنگ لێیدا) . (أشرقت الارض) و (دق الجرس).

٢) پاشەکی (التالی) : لە نموونەی یەکەمدا ڕۆژ هەیەو نموونەی دووەم : کاتی وانەکە هاتووە : (النهار موجود) و (قد حان وقت الدرس).

٣) بەستەر (الرابطة) : ئامرازی پەیوەندییە وەکو (اذا) و (الفاء) لە نموونەی یەکەمدا و (کلما) و (الفاء) لە نموونەی دووەمدا .

## دابەشکردنی گوتە (القضية)

١. ئەرێنی (الموجبة) : هەواڵێکی ئەرێنییە.

وەکو (المدرسة كبيرة) واتە : قوتابخانە گەورەیە .

(اذا اشرقت الشمس فالنهار موجود) واتە : گەر خۆر هەڵات ڕۆژ هەیە.

٢. نەرێنی (السالبة) : هەواڵێکی نەرێنییە.

نموونە : (خالد لیس بغائب) خالید غائیب نییە.

واتە : هەموو کاتێك کە زەنگ لێ دەدات کاتی وانە نییە.

بەشەکانی هەڵگری (أقسام الحملية)

هەڵگری بە ئەرێنی و نەرێنییەوە بە گوێرەی بابەتەکەی دەبێتە چەند بەشێك :

١) الشخصية – کەسێتی : بابەتەکەی هەندەکییە (الجزئي) ، وەکو : (البصرة مناء العراق) بەسرە بەندەری عێراقە. (انت کاتب) تۆ نووسەری ، (محمود لیس بمجتهد) مەحمود موجتەهید نییە ، (هو لیس شاعر) ئەو شاعر نییە.

٢) سروشتی (الطبیعة) : بابەتەکەی هەمەکییە (کلیا) ، وەکو : (الانسان نوع) مرۆڤ جۆرێکە.

٣) بێ سنوور (الهملة) بابەتەکەی هەمەکییە ، بڕیار لەسەر بەڵگە بەڕاست دانراوەکانی (المصادیق) دەدرێ ، لەگەڵ گوێ نەدان بە دەرخستنی بڕی ئەو بەڵگە سەلمێنەرانەی بڕیاریان لەسەر دەدرێت. وەکو (الانسان فی الخسر) واتە : مرۆڤ لە زیاندایە .

(المؤمن لا یکذب) واتە : بڕوادار درۆ ناکات .

٤) قەتیس کراو (المحصورة) : بابەتەکانی هەمەکییە ، بڕیار لەسەر بەڵگە بەڕاست دانراوەکانی دەدەین ، لەگەڵ قەتیسی و سنووری بڕی بەڵگە بەڕاست دانراوە بڕیار لەسەر دراوەکانی ، هەمووی یان بەشێکی وەکو : (کل نبي مبعوث من قبل الله) هەموو پێغەمبەرێك لەلای خوا ڕەوانە کراوە ، (بعض الطلاب فقراء) هەندێ قوتابی هەژارن.

## بەشکردنی قەتیس کراو (المحصورە)

ئەم بەشە بەسەر دوو بەشدا دابەشدەبێت :

١. هەمەکی (الكلية) : بڕیار لەسەر هەموو بەڵگە بەڕاست دانراوەکانی دەدرێت.

٢. هەندەکی (الجزئية) : بڕیار لەسەر هەندێ بەڵگە بەڕاست دانراوەکانی دەدرێت.

(بعض المدارس دينية) هەندێ قوتابخانە ئاینین.

(بعض الطلاب ليسوا بمجتهدين) هەندێ قوتابی هەوڵ نادەن.

بە کورتی :



**بەشکردنی هەڵگری ئـەرێنی (الحمليـه الموجبـه) بـە پێی شـوێنەکانی بـوون (الوجود)**

١) زەینـی (الذهنيـة) : شـوێنی بابەتەکـەی زەینییـە : وەکـو (خـودا هاوبەشـی نییە) ڕێتیَ نەچووە (شريك الخالق مستحيل). چـەمکی هاوبەشـی (خـودای کردگار) لە زەیندا شوێنی نییـە ، چونکە لـە واقیعـی دەرەکیـدا بەڵگەیـەکی یەقینداری نییە.

٢) دەرەکی (الخارجية) شوێنی بابەتـەکەی دەرەکییـە ، واتـە : بڕیـار دان تێیـدا ئاڕاسـتەکەی ئـەو بـڕوا بەڕاسـت دانراوانـەی بابەتەکـەی دەکـرێ ، کـە لـە دەرەوەدا هەیـە ، وەکـو "کـل طالـب يحضـر درسـة غـدا" هـەموو قوتابیـان بـەیانی لـە وانـەکانیان ئامـادە دەبـن ، مەبەسـت لـە هـەموو (کـل) ئـەو قوتابیانەیە لە ئارادانە .

٣) حەقیقی : شوێنی بابەتەکەی لە دەرەوەی ئێستاو ئایندە دایە .

واتە : بڕیاردان تێیـدا ئاڕاسـتەی ئـەو بـڕوا پـێ کـراوە بابەتییـە دەکـرێ لـە دەرەوەی هەنووکەدا هەیەو داهاتوو دێتە ئاراوە . وەکو (كل من قال لا اله الا اللع فهو مسلم) واتە : هەر کەس بڵێ (لا اله الا الله) موسڵمانە .

مەبەسـت لەوەیـە هـەر کەسـێك وشـەی (شـەهادە) بڵـێ لـەو خەڵکانـەی لـە دەرەوەی هەنووکەدان و ئەوانەی داهاتووش پەیدا دەبن .

## بەشەکانی مەرجییە (الشرطیة)

مەرجییە دەبیَ بە دوو بەشەوە :

١. لکاو (المتصلة) : بریتییە لە بڕیاردان تیَ یدا بە بوونی پەیوەندی نێوان دوو گوتە (القضیة) یان نەرێنی کردن (النفي) لە بوونی پەیوەندی لە نێوان ئەم دووانەدا .

وەکو (اذا اشرقت الارض فالنهار موجود) گەر خۆر هەلاَت ڕۆژ بوونەوە هەیە .

(لیس کلما دق الجرس فقد حان وقت الدرس) هەر کاتیَ زەنگ لیَ یدا مەرج نیە کاتی وانە خوێندن بێت.

دابەشکردنی :

ئەویش بەسەر دوو کەڵدا دابەش دەبێت :

١) پێوە نووسان (اللزومیة) : ئەو لکاوەیە لە نێوان پێشەکی (المقدمة) و پاشەکی (المؤخرة) دا پەیوەندییەکی ڕاستەقینە هەیە (اذا سخن الماء فانە یتمدد) ئەگەر ئاو گەرم دەکشێت.

٢) ڕێك کەوتن (الاتفاقیة) : ئەو لکاوەیە لە نێوان پێشەکی و پاشەکییەکەیدا هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەقینە نییە ، بۆ نموونە : (کلما دق الجرس تأخر محمد قلیلا عن دخول الصف) ، واتە : هەر کاتێك کە زەگ لێدەدات محمد کەمێك دوا دەکەوێت لە چوونە ناو پۆلەوە ، کەواتە ڕێککەوتنەکە هەمیشەییە.

٢. نـەلکاو (سـەربەخۆ) (المنفصلة) : واتـە : دابـڕاو و نـەلکاو ، ئەو چـەمکەیە بڕیاری جیابوونەوەی تێدا دەدرێ لە نێوان دوو گوتـە (القضیة)دا ، یان بـە نەرێنی جیابوونەوە لە نێوان ئەو دوانەدا .

نموونە : (العدد اما ان یکون فردا او زوجا) (لیس الانسان اما ان یکون کاتبا او شاعرا) واتە : مرۆڤ یان نووسەر یان شاعیر نییە.

## دابەشکردنی نەلکاو (المنفصل) یان سەربەخۆ

نەلکاو دەبێتە دووبەشەوە :

١) نەسـەلمێنی (العنادیـة) : ئـەو نەلکاوەیـە لـە نێـوان پێشـەکی و پاشـەکی (المقدمـة والتـالی)یەکەیـدا جیـاوازی و نەسـەلمێنییەکەی حـەقیقی هەیـە ، وەکو : (العدد الصحیح اما ان یکون زوجا او فـردا) ژمـارەی ڕاسـت جووتـە یان تاکە .

٢) ڕێکـەوت (الاتفاقیـة) : ئـەو نەلکاوەیـە لـەنێوان پێشـەکی و پاشـەکیدا جیاوازی و ڕێکەوتنێکی ناڕاست هەیە ، نمونە : (اما ان یکون المدرس الذي في الصف الاول علیا او احمد) واتە : مامۆستای سـەر پۆلی یەکـەم عـەلی یـە یان ئەحمەدە .

کەوات لەم دوو مامۆستایە زیاتر ناچنە ناو پۆلی یەکەمەوە.

(بەشەکانی نەلکاو)

دیسان (نەلکاو) لەسەر بناغی ئەگەر نەبوونی کۆبوونەوەی پێشەکی و پاشەکی یان پێکەوە دەبێتە چەند بەشێکی ترەوە :

١) حەقیقی : ئەویش دوو کەڵی لێ دەبێتەوە :

أ- حەقیقی ئەرێنی (الحقیقة الموجبة) : بڕیار دانە لە ئەگەر نەبوون (الاستحالة)ی کۆبوونەوەی دوو لایەن و لابردنیان : وەکو : ژمارەی ڕاستەقینە جووتە یان تاکە .

لێرەدا (تاك) و (جووت) کۆنابنەوە ، یان جووت دەبن یان تاك ، ئەم دوو ڕێژەیەش لانابرێن ، کە نە جووت بن و نە تاك بن .

ب- حەقیقەتی نەرێنی (الحقیقة السالبة) : دەتوانرێ بڕیار لەسەر کۆبوونەوەی هەر دوو لا بدرێ و یان لا ببرێت وەکو : (لیس الحیوان اما ان یکون ناطقا او اما ان یکون قابلا للتعلیم) واتە : گیاندار نابێ قسەکەر بێ یان توانای فێرکردنی نەبێت .

لێرەدا (قسەکەر)ی و (فێرکردن) لە مرۆڤدا کۆدەبنەوەو پێکەوە هەوڵ دەدەن ، چونکە هەردوو تواناکانی تێدا هەیەو لە گیانداراندا لادەبرێ ، چونکە نە قسەکەرن و نە فێر دەکرێن لەم بوارەدا .

٢) ڕێگری کۆبوونەوە (مانعة الجمع) : ئەویش دوو کەڵی لێ دەبێتەوە :

١. ڕێگری کۆبوونەوەی ئەرێنی (مانعة الجمع الموجبة) : ئەوەیە بڕیاری لەسەر دەدرێ کە هەردوو لاکانی شیاو نیە کۆببنەوەو دەتوانرێ لاببرێن ، وەکو (اما ان یکون الجسم أبیض أو أسود) واتە : تەن یان ڕەشە یان سپی یە .

دەتوانرێ لا ببرێ وەکو لە تەنی سەوز(الاخضر)دا کە نە ڕەشە نە سپی یە .

٢. ڕێگری کۆبوونەوەی ئەرێنی (مانعة الجمع السالبة) : ئەوەیە بڕیار دەدرێ لەسەر توانای کۆبوونەوەیان و ئەگەر نەبوونی لابردنیان : (لیس اما ان یکون الجسم غیر الابیض او غیر الاسود) واتە : تەن یان غەیری سپی یە یان غەیری ڕەش نابێ ، غەیری سپی و غەیری ڕەش لە تەنی سەوزدا کۆدەبنەوە ، بەڵام لە یەك تەندا پێکەوە هەڵناگیرێن چونکە یان غەیری ڕەشن یان غەیری سپین لە ڕەنگەکانی تر.

٣. ڕێگری لە تیانەبوون : ئەویش دوو لقی لێ دەبێتەوە :

١) ڕێگری تیا نەبوونی ئەرێنی (مانعة الخلو الموجبة) : بڕیار لەسەر توانای کۆبوونەوەی هەردوو بەشیان و نەشیانی لابردنیان و هەڵگرتنیان دەدرێت:

وەکو (الجسم اما ان یکون غیر أبیض او غیر اسود) واتە : تەن یان غەیری سپی یان غەیری ڕەشە ، دەتوانرێ غەیری ڕەش و غەیری سپی کۆبکرێتەوە ، ئەگەر ڕەنگی سوور یان سەوز بێت ، ناشێ غەیری ئەو دووانە لە ڕەش و سپی لابرێن.

٢) ڕێگری تیانەبوونی نەرێنی (مانعة الخلو السالبة) : ئەمەیان بڕیاری ئەگەر نەبوونی هەردوولای تێدا دەدرێ کە دەتوانرێ لابرێن ، وەکو (لیس اما ان یکون الجسم ابیض واما ان یکون الاسود) واتە : تەن هەر سپی یان هەر ڕەش نابێ ، چونکە هەندێ جار سپی نیە هەندێ جار ڕەش نیە ، وە ڕەش و سپیش پێکەوە کۆ نابنەوە .

پوختە:




**************************************

## بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ (الاستدلال غیر مباشر)

پێناسـە : بەڵگـە هێنانـەوەی ناڕاسـتەوخۆ : هێنانـەوەی بەڵگەیـە لەسـەر پێوەنووساوی خوازراوەکە (لازمة المطلوب) ، بەنیازی سەلماندنی .

واتـە : بەڵگـە هێنـاوەوەی ناڕاسـتەوخۆ لـەو گوتـەو قەزیانـە دا دەبـێ ، کـە دژوارە ڕاستەوخۆ بەڵگەیان لەسەر بهێنرێتەوە .

بۆ نمونە : خوازراوەکە (مطلوب) ئەوەیـە ئـەو گوتەیـە بسـەلمێنرێت (الـروح الموجود) واتە : گیان لە ئارادایە ، مادام ناتوانرێ بە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی بەڵگـە هێنانەوەی ڕاستەوخۆ بسەلمێنرێ ، پێویستە لێرەدا پەنا بۆ بەڵگە هێنانەوەی نـا ڕاستەوخۆ ببەین ، کە پێوە نووسـاوەکەیەتی (اللازمیـة) : (الـروح غـیر موجـود)

واتە : گیان لە ئارادا نییە ، لێرەدا بەڵگە لەسەر ڕاستی و ناڕاستی دەهێنێتەوە تا دەگەینە سەلماندنی مەبەستەکە .

لە کاتێکدا بەڵگەی فەلسەفی ئەوەی سەلماند گوتەی دووەم کە دەڵێ : (گیان لە ئارادا نییە) درۆیە ، کەواتە پێویستە گوتەی یەکەم بەڕاست وەربیگرێت (گیان لە ئارادایە) .

بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ

پێناسە : بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ : هێنانەوەی بەڵگەیە لەسەر پێوە نووساوی خوازراوەکە (لازمة المطلوب) بە نیازی سەلماندنی .

واتە : بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ لەو گوتەو هەواڵانە (القضايا) دا دەبێ ، کە دژوارە ڕاستەوخۆ بەڵگەی لەسەر بهێنرێتەوە .

بۆ نموونە : خوازراوە (مطلوب) ئەو گوتەیە بسەلمێنرێت : (الروح الموجود) . واتە : گیان لە ئارادایە . مادام ناتوانرێ بە ڕێگایە لە ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوەی ڕاستەوخۆ بسەلمێنرێ ، پێویستە لێرەدا پەنا بۆ بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ ببەین : کە پێوە نووساوەکەیەتی (اللازمية) : (الروح غير موجود) واتە : گیان لە ئارادا نییە ، لێرەدا بەڵگە لەسەر ڕاستی و ناڕاستی دەهێنێتەوە تا دەگەینە سەلماندنی مەبەستەکە .

لەکاتێ دا بەڵگەی فەلسەفی ئەوەی سەلماند کە گوتەی دووەم کە دەڵێ : گیان لە ئارادا نییە ، درۆیە ، کەواتە پێویستە گوتەی یەکەم بە ڕاست

وەربگیرێت (گیان لە ئارادایە) ، چونکە دوو شتی پێچەوانەن هەردووکیان وێکڕا بە ڕاست یان بەدرۆ دانانرێن.

## پێکەوە نووسانی دوو گوتە (التلازم بين القضيتين)

لەسەر ئەم بناغانەی خوارەوە دادەمەزرێن :

١. نووسانی ڕاستی گوتەی دووەمی (خوازراوەکە) لەبەر ناڕاستی گوتەی یەکەم ، کە (بەڵگەی لەسەر هێنرایەوە) .

٢. نووسانی درۆی گوتەی دووەمی (خوازراوەکە) لەبەر ڕاستی گوتەی یەکەم کە بەڵگەی لەسەر هێنرایەوە .

٣. نووسانی ڕاستی گوتەی دووەمی خوازراوەکە لەبەر درۆی گوتەی یەکەم ، کە بەڵگەی لەسەر هێنرایەوە .

٤. نووسانی درۆی گوتەی دووەمی مەبەست لەبەر درۆی گوتەی یەکەم ، کە بەڵگەی لەسەر هێنرایەوە.

ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ

وەکو باسکرا لە ڕابردوودا ئەم بەشە سێ ڕێگای هەیە :

١. لەیەك نەچوو (التناقض) .

٢. پێچەوانەی ئاست (العكس المستوي).

٣. پێچەوانەی دژ (العكس النقيض) .

لێرەدا نووسەر دەنووسێ :

---

## (دژ) ، لەیەك نەچوو (التناقض)

وهو اختلاف القضيتين (بالايجاب و السلب) بحيث يتقضي لذاته ان تكون احدهما : (صادقة) والاخرى : (كاذبة) كقولنا : (زيد كاتب) و (زيد ليس بكاتب) . ولا يتحقق ذلك الا بعد اتفاقها في (الموضوع) و (المحمول) و (الزمان) و (المكان) و (الاضافة) و (القوة) و (الفعل) و (الجزء) و (الكل) و (الشرط) .

و (نقيض الموجبة الكلية) انما هي : (السالبة الجزئية) كقولنا : (كل انسان حيوان) و (بعض الانسان ليس بحيوان) .

و (نقيض السالبة الكلية) انما هي : الموجبة الجزئية ، كقولنا : (لا شيء من الانسان بحيوان) و (بعض الانسان حيوان) .

(والمحصورتان) : لا يتحقق التناقض بينهما الا بعد اختلافهما في (الكمية) ، لأن (الكليتين) : قد تكذبان " كقولنا (كل انسان كاتب) . (ولا شيء من الانسان بكاتب).

(والجزئيتين) : قد تصدقان كقولنا (بعض الانسان كاتب) و (بعض الانسان ليس بكاتب).

---

واته : دژایەتی (له یەك نەچوو) یان (التناقض) : بریتییە لە ناکۆکی نێوان دوو گوتە (القضیتین) بە (ئەرێ) و (نەرێ) ، کە ئەو ناکۆکی و جیاوازییە لە خودی ئەو (دوو گوتە) دابنێ ، کە یەکێکیان (ڕاست) بێ و ئەویتر (درۆ) بێت ، وەکو (زەید درۆزنە) و ( زەید درۆزن نییە) .

ئەو جیاوازییە تەنیا لەم کاتەدا دێتە ئاراوە ، کە ئەو ( دوو گوتە) لە بابەت ( الموضوع) و هەڵگیراو (المحمول) و (کات) و (شوێن) و سەرباره (الاضافة) و (توانا) و (کردار) و (هەموو) و (هەندەك) و (مەرج) وەك یەکبن و ناکۆك نەبن.

ئەو گوتەیەی (لەیەك نەچووی ئەرێداری هەمەکی)یە تەنیا لەگەڵ (نەرێداری هەندەکی) وێك چوو نییە ، وەکو : (هەموو مرۆڤەکان گیانلەبەرن) و (هەندێ مرۆڤ گیان لەبەر نین) ، گوتە قەتیس کراوەیەکان (المحصورات) : لە کاتێکدا ناکۆکی و دژایەتی دەکەوێتە نێوانیان کە جیاوازی لە (هەمەکی) و (هەندەکی) یاندا دروست دەبێ ، چونکە هەندێ جار (دوو هەمەکی) درۆ دەکەن ، وەکو : (هەموو مرۆڤێك نووسەرە) و (هیچ مرۆڤێك نووسەر نییە) .

---

ڕاڤە

(دژ) یان (لێك نەچوو – التناقض) : بریتییە لە نووسان لەنێوان دوو گوتە (القضیتین)دا ، بەشێوەیەك گەر بڕوا بە یەکێ لەو گوتانە بکرێ ، گوتەی دووەم بە درۆ دەخاتەوە .

ئەم چەمکە بەکاردێ لە گوتەکان (القضایا)دا لە دوو جۆردا کە جۆری یەکەم و دووەمی جۆرەکانی (نووسانی نێوان دوو گوتە–التلازم القضیتین)یە، کە بریتین لە :

١. نووسان و لکانی ڕاستی گوتەی دووەمی (مەبەست) ، لەبەر درۆی گوتەی یەکەم ، کە بەڵگەی لەسەر هێنراوەتەوە .

٢. نووسان و لکانی ڕاستی گوتەی دووەمی (مەبەست) ، لەبەر ڕاستی گوتەی یەکەم کە بەڵگەی لەسەر هێنراوەتەوە .

مەرجەکانی :

لەو دژایەتیەدا مەرجە لە نێوان دوو گووتەکەدا یەکبوون هەبێ لە چەند مەسەلەیەکدا و لە چەند مەسەلەیەکی تریشدا جیاوازی هەبێ ، وەك لێرەدا ڕوونی دەکەینەوە :

(١) یەکێتی لە بابەتدا (الاتحاد) بەیەکەهەشتییە (الوحدات الثمانیة)کان ناسراون :

١. یەکێتی لە بابەتدا (الاتحاد في الموضوع) .

گەر دوو (گوتە) لە بابەتەکەدا جیاواز بوون ئەوە (دژایەتی) نییە ، (عەلی قوتابییە) (ئەحمەد قوتابی نییە) .

٢. یەکێتی لە هەڵگیراو (المحمول) دا .

گەر دوو (گوتە) لە بابەتەکەدا جیاوازبوون ئەوە (دژایەتی)نییە (عەلی قوتابی) یە ، (ئەحمەد قوتابی نییە) .

گەر دوو گوتە لە هەڵگیراوەکەدا جیاواز بوون ئەوە (دژایەتی) نییە ، وەکو : (زكي طالب) زەکی قوتابییە (زكي ليس بمعلم) زەکی مامۆستا نییە .

٣. یەکێتی لە کاتدا ، گەر دوو گوتە لە کاتدا جیاواز بوون مانای ناکۆکی ودژایەتی نییە وەکو: (الشمس مشرقة في النهار) (الشمس ليس بمشرقة في الليل) .

واتە : (خۆر لە ڕۆژدا دەرکەوتووە) (خۆرە لە شەودا دەرنەکەوتووە) .

٤. یەکێتی لە شوێندا : گەر دوو گوتە لە شوێندا جیاواز بوون مانای ناکۆکی و دژایەتی نییە ، وەکو : (الارض مخصبة في الريف) (الارض ليست بمخصبة في البادية) واتە : خاك لە لادانی دا بە پیتە ، خاك لە بیاباندا بە پیت نییە.

٥. یەکێتی لە تواناو کردار : گەر دوو گوتە لە تواناو کرداردا جیا بوون ئەوە پێیان ناگوترێ (دژ)ن ،

وەکو : (محمد ميت بالقوة) و (محمد ليس بميت بالفعل).

واتە : (محمد بە توانا مردووە) (محمد بە کردار نەمردووە).

٦. یەکێتی لە هەمەکی و هەندەکی دا :

گەر دوو گوتە لە هەمەکی و هەندەکی دا جیاواز بوون ئەوە (دژ) نین ، وەکو : (العراق مخصب بعضه) (العراق ليس بمخصب كله) (عیراق هەندێکی بە پیتە) (عیراق هەمووی بە پیت نیە).

٧. یەکێتی لە مەرج (الشرط) : گەر دوو گوتە لە (مەرج)دا جیا بوون ئەو (دژ) نین ، وەکو : (الطالب ناجح ان اجتهد) (الطالب غير ناجح ان لم يجتهد) (گەر قوتابی هەوڵ بدات دەرچووە) (گەر قوتابی هەوڵی نەدابێت دەرناچێت).

٨. یەکێتی لەسەرباره (الاضافة) دا :

گەر دوو گوتە لەسەر سەرباره دا جیاواز بوون ئەوکاتە (دژ) نین ، وەکو : (الاربعة نصف بالاضافة الی ثمانیة) (الاربعة لیست بنصف بالاضافة الی العشرة) .
واتە : (چوار بەسەرباری هەشت نیوەیە) (چوار بەسەرباری دە نیوە نییە) .

## مەرجەکانی جیاوازی کاری (شروط الاختلاف)

١. جیاوازی بە چەندێتی (الکم) یە ( هەمەکی و هەندەکی)دا : ئەگەر دوو گوتە لە هەمەکی و هەندەکی دا ڕێك کەوتن ئەو کاتە دژ نین ، وەکو (بعض المعدن حدید) (بعض المعدن لیس بحدید) ، واتە : (هەندێ کانزا ئاسنە) (هەندێ کانزا ئاسن نیە) ئەم دوو هەواڵ و ووتەیە هەردووکیان ڕاستن و دژایەتی (التضاد) نییە لە نێوانیان.

(وکل حیوان انسان) (ولا شیئ من الحیوان بالانسان) (هەموو گیاندارێك مرۆڤە) (هیچ بەشێکی گیانداران مرۆڤ نییە) ، ئەو دوو گوتەیە هەردووکیان ناڕاستن.

٢. جیاوازی لەچۆنیەتی (الکیف) لە(موجەب و سالیب)دا واتە ئەرێنی و نەرێنی دا .

ئەگەر دوو گوتە لە ئەرێنی و نەرێنی دا ڕێك کەوتن (دژایەتی) پەیدا ناکەن ، وەکو (کل انسان ناطق) (بعض الانسان ناطق) واتە : (هەموو مرۆڤێك قسەکارە) (هەندێ مرۆڤ قسەکارە) هەردوو هەواڵەکە ڕاستە . (بعض الانسان لیس بحیوان) ( کل انسان لیس بحیوان) (هەندێ مرۆڤ گیاندار نییە) (هەموو مرۆڤێك گیاندار نییە) هەردوو گوتەکە ناڕاستن .

بە کورتی : (ئەرێنی گشتی) دژی (نەرێنی هەندەکی)یە.

(ئەرێنی هەندەکی) دژی (نەرێنی هەمەکی) یە .

چۆن دەتوانین سوود لە بەلگە هێنانەوە بە (دژ) وەربگرین ؟!

ئەو کەسەی بەلگە بە (دژی هەواڵ) دێنێتەوە کە (مەبەستە بەلگەی بۆ بهێنرێتەوە بۆ ڕاستی و درۆیەکەی بەلگە دێنێتەوە) ، گەر ڕاستی گوتەی (دژ)ەکە بە بەلگە سەلما ئەم ڕێسای دوو دژیەی بەسەردا جێ بەجێ دەبێت (دوو دژ پێکەوە بە ڕاست دانانرێن و پێکەوەش بە درۆ دانانرێت) ئەوکاتە گوتە مەبەستەکە بەدرۆ دەردەچێت.

گەر گوتەی (دژ)ەکە بەدرۆ گەڕا ، دوای پیادەکردنی ڕێسای دوو دژە (النقیضین) : گوتە خوازراوەکە بە ڕاست دەگەڕێت ، وەکو : (لا شيء من الارواح بموجودة) واتە : هیچ کام لە گیانەکان لە ئارادانین ، پێویستە ئەم گوتە (القضیة) ڕاست یان درۆکەی بسەلمێنن ، گریمان : بەکارهێنانی ڕێگاکانی (بەلگە هێنانەوەی ڕاستەوخۆ –الاستدلال المباشر) بۆ سەلماندنی مەبەست یان خوازراوەکە (المطلوب) دژوارە.

بەلگە هێنەرەوەکە ڕوو لە بەکارهێنانی ڕێگاکانی (بەلگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ) دەکات ، کە بریتیە لە ڕێگاکانی (دژ – التناقض) و دەڵێ : مەبەست (لا شيء من الارواح بموجود) واتە : هیچ شتێك لە ڕووحەکان لە ئارادا نییە .

دژەکەی (الارواح موجود) واتە : گیانەکان لە ئارادان.

بەلگە هێنانەوە (الاستدلال) : بە بەلگە (البرهان) ی سەلماو لە شوێنی خۆیدا دژەکەی ڕاستە ، کە (ڕووحەکان لە ئارادا نین) بەدرۆ دابنرێن ، چونکە دوو دژ

پێکەوە بە ڕاست و درۆ لە یەك کاتدا دانانرێ ، بەڕاست دانانی یەکێکیان ئەویتر یان بە درۆ دەخاتەوە ، بۆیە سەرەنجام : (هیچ کام لە گیانـەکان لـە ئـارادا نییـە) ناڕاستەو درۆیە.

کورتە :

ئەمە هەنگاوەکانی بەڵگە هێنانەوەیە بە (دژ) :

١. دیاریکردنی خوازراو و مەبەست (المطلوب) .
٢. دیاریکردنی دژ (النقیض) .
٣. بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاستی و ناڕاستی (دژەکە) .
٤. پیادەکردنی ڕێسای دوو دژەکە . (قاعدة النقیضین) .
٥. ئەنجام (النتیجة) .

## پێچەوانە کردنەوە (العکس)

هو ان يصير الموضوع محمولا ، والمحمول موضوعا مع بقاء الايجاب والسلب بحالة والتصديق والتكذيب بحاله ، الموجبة الكلية لا تنعكس كلية اذ يصدق قولنا (كل انسان حيوان) ولا يصدق (كل حيوان انسان) بل تنعكس جزئية لأنا اذا قلنا : (كل انسان حيوان) يصدق (بعض الحيوان انسان) ، فانما نجد شيئا معينا موصوفا بالانسان والحيوان فيكون بعض الحيوان انسانا ، و (الموجبة الجزئية) ايضا تنعكس جزئية هذه الحجة ، (والسالبة الكلية) تنعكس كلية ، وذلك بين نفسه فانه اذا صدق (لا شيء من الانسان بجحر) صدق : (لا شيء من الحجر بالانسان) (والسالبة الجزئية) لا عكس لها لزوما لانه لا يصدق بعض الحيوان ليس بانسان ولا يصدق عكسه.

واتە :

پێچەوانە یان ئاوەژوو کردنەوە (انعکس) : بابەتی گوتەکە (القضية) بگۆڕێ بە هەلگیراو (المحمول) وە هەلگیراویش بگۆڕێ بە بابەت (الموضوع) ، لەگەڵ هێشتنەوەی (ئەرێ) و (نەرێ) و ڕاستی و درۆی (گوتەکان) وەکو خۆیان ، (گوتەی هەمەکی ئەرێنی) بە شێوەی هەمەکی (الكلية) پێچەوانە ناکرێتەوە ، چونکە ئەو گوتەی ئێمە (هەموو مرۆڤێك گیانداره) بەلاّم ڕاست نییە بڵێین (هەموو گیانداران مرۆڤن).

بەڵکو ئەو (گوتە هەمەکییە ئەرێیە) بە (گوتەی هەندەکی) پێچەوانە دەکرێتەوە لەبەر ئەوەی گەر وتمان (هەموو مرۆڤ گیاندارن) کردمان بە (هەندێ گیاندار مرۆڤن) ڕاست دەرناچێت.

بەو پێیە لێرەدا شتێکی زانراومان دەست دەکەوێ بە مرۆڤ و گیاندار وەسف کرابێت کەواتە (هەندێ گیاندار مرۆڤە) دووبارە دەتوانرێ (ئەرێنی هەندەکی – الموجبة الجزئية) بەهەمان پاساو بەڵگە (هەندەکییەکە) پێچەوانە بکرێتەوە ، وە نەرێنی هەمەکی (الموجبة الكلية) پێش هەمەکی ئاوەژوو بکرێتەوە .

خۆی ڕوونی کردۆتەوە ئەگەر ئەوە ڕاستە کە دەڵێین : (هەموو مرۆڤێك بەردینیە) کەواتە ئەمەشیان ڕاستە کە بڵێین (هیچ بەدرێك مرۆڤ نییە) .

وە (نەرێنی هەندەکی) پێچەوانە ناکرێتەوە ، چونکە گەر ئاوەژوو بکرێتەوەو بڵێین (هەندێ گیاندار مرۆڤ نین) پێچەوانەکەی ڕاست دەرناچێت .

---

**ڕاڤە :**

(العكس) واتە : پێچەوانە کردنەوە ، ئاوەژوو کردنەوە ، واتە گێڕانەوەی شتێك بۆ ڕێسای خۆی کە لەسەری بووە لەسەرەتادا ، نموونە : پێچەوانەکردنەوە لە ئاوێنەدا ، پاشان (العكس) بە مانای (نفي الشيء) هاتووە ، بۆ نموونە : (عكس الاثبات نفي) ، واتە : پێچەوانەی سەلماندن نەرێیە.

لێرەدا لە لۆژیکدا باسی دوو ئاوەژوو کردنەوە دەکرێ یان دوو پێچەوانە (العکس) ئەویش : (العکس المستوی) و (عکس النقیض) ، کە لە یەك بواردا بەکاردێن ، وەك لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت.

## پێچەوانەی ئاست ( العکس المستوی )

بریتی یە لە : گۆڕینی هەردوو لای گوتەکە (طرفي القضية) لەگەڵ مانەوەی چۆنیەتی (الکیف) و ڕاستییەکەیدا مەبەست لە (گۆڕین) لێرەدا گۆڕینی بابەتی گوتەکەیە کە بڕیار لە (سەر ڕاستییەکەی دراوە) بۆ (هەڵگیراو) ، وە گۆڕینی (هەڵگیراوە) بۆ بابەتەکە (الموضوع) ، یان گۆڕینی پێشەکی (المقدم) بۆ پاشەکی (التالی) ، یان گۆڕینی پاشەکییە بۆ پێشەکی لەگەڵ هێشتنەوەی ڕاستییەکە (الصدق) و مانەوەی چۆنیەتی (الکیف)ی (ئەرێنی و نەرێنی)یەکەدا. (گوتەی یەکەم) بە بنەڕەت (الاصل) دەناسرێ و (گوتەی دووەم) بە (پێچەوانەی ئاست) ناو دەبرێت ، بەو پێیە لە (پێچەوانەی ئاست)دا ئەگەر (گوتەی بنەڕەتی) بە ڕاست دابنێ ی ئەو کاتە گوتە پێچەوانەکەشت بە ڕاست داناوە.

ئەم (پێچەوانەی ئاست)ە لە گوتەکانی جۆری سێیەم دا (القضايا نوع الثالث) دا دەنرێت ، لە جۆرەکانی (نووسان لەنێوان دوو گوتەدا — التلازم بين القضيتين) ، واتە : گەر گوتەی دووەم بە ڕاست دانرا لە (مەبەست)دا ، گوتەی یەکەمیش کە بەڵگەی بۆ هێنراوەتەوە بە ڕاست هەژمار دەکرێت.

**مەرجەکانی**

لە پێچەوانەی ئاستدا ئەو مەرجانە ڕەچاو دەکرێت :

١. گۆڕینی هەردوولاکە (تبدیل الطرفین) : واتە گۆڕینی بابەت (الموضوع) بە هەلگیراو (المحمول) وە گۆڕینی (هەلگیراو) بە (بابەت) یان گۆڕینی (پێشەکی) بۆ (پاشەکی) و (پاشەکی) بۆ (پێشەکی) .

٢. مانەوەی چۆنیەتی (بقاو الکیف) : واتە گەر گوتەی یەکەم (ئەرێنی) بوو ، پێویستە گوتەی دووەمیش ئەرێنی بێت ، گەر گوتەی یەکەم نەرێنی بوو پێویستە گوتەی دووەمیش نەرێنی بێت.

٣. مانەوەی ڕاستیەتی (بقاء الصدق) : ڕەچاوی ئەوە دەکرێ کە گۆڕینی ئەو دوو لایەنە گوتەی دووەم بەدرۆ ناخاتەوە.

**سەرەنجام :**

لەگەڵ دابین کردنی ئەو مەرجانەی پێشەوەدا ئاکامەکانی پێچەوانەی ئاست ئاوا دەردەچێت :

١. ئەرێنی هەمەکی (الموجبة الکلیة) ئەرێنی هەندەکی (موجبة الجزئیة) پێچەوانە دەکاتەوە :

(کل ماو سائل) هەموو ئاوێك شلە ، بەڕاست دانەری (بعض السائل ماء) (هەندێ ئاو شلە).

(کل انسان ناطق) هەموو مرۆڤێك قسەکارە ، بەڕاست دانەری (بعض انسان ناطق) (هەندێ مرۆڤ قسەکارە).

٢. نەرێنی هەندەکی (السالبة الجزئیة) : پێچەوانەی نییە ، ئەمەش لەبەر دواکەوتنی ئەنجامی بەڵگە هێنانەوەیە لە هەندێ دیمەنی دا ، کە ئەمانەن : لەوانە : ئەگەر (بابەتی هەواڵەکە نەرێنی هەندەکی) گشتی تر بوو لە هەڵگیراوەکە (المحمول) وەکو (بعض الحیوان لیس بانسان) واتە : هەندێ گیاندار ئاژەڵ نیە ، ئەو کاتە دروست نییە بگوترێ (لا شيء من الانسان بحیوان) واتە (هیچ شتێ لە مرۆڤ گیاندار نیە) ، یان (بعض الانسان بحیوان) واتە : هەندێ مرۆڤ گیاندار نییە ، چونکە هەردووکیان ناڕاستن ، ڕابردوو باسکرا یەکێ لە مەرجەکانی (پێچەوانەی ئاستی) مانەوەی ڕاستی (الصدق)ە .

چۆن بەڵگە بە (پێچەوانەی ئاستی) دەهێنرێتەوە ؟

دەبێ بابای بەڵگە هێنەرەوە بەڵگە لەسەر (گوتە خوازراوەکە — القضیة المطلوب) بێنێتەوەو پێچەوانەی بکاتەوەو بەڵگە لەسەر ڕاستی (گوتەی دووەم) بێنێتەوە ، پاش ئەوەی ڕاستییەکەی دەسەلمێنێ ڕێسای پێچەوانەی ئاست پراکتیك دەکات ، کە دەڵێ : (اذا صدق الاصل صدق عکسه) واتە : ئەگەر بناغەکە ڕاستی کرد پێچەوانەکەشی ڕاست دەکات ، وەکو (بعض الماء سائل) واتە : هەندێ ئاو شلە . خوازراوەکە (المطلوب) سەلماندنی ڕاستی ئەو گوتەو هەواڵەیە.

گریمانکراو لێرەدا بەکارهێنانی (ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوەی ڕاستەوخۆ) بۆ سەلماندنی مەبەستەکە دژوارە.

بۆیە بابای بەڵگە هێنەرەوە هەڵدەستی بە بەکارهێنانی ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ کە ڕێگای پێچەوانەی ئاستە دەڵێ :

خوازراوەکە هەندێ ئاو شلە.

بناغە : هەموو ئاو شلە.

بەڵگە هێنانەوە (الاستدلال) : لە شوێنی خۆیدا بە بەڵگە (البرهان) سەلماوە ، کە بناغەکە ڕاستە کە دەڵێ (کل ماء سائل) واتە هەموو ئاوێك شلەیە بۆیە پێویستە پێچەوانەکەشی ڕاست بێ ، کە دەڵێ : (هەندێ لە شلەکان ئاوە) ، چونکە بناغەکە ڕاست بێ دەبێ پێچەوانەکەشی ڕاست بێ.

ئەنجام : (هەندێ شلە ئاوە) ڕاستە .

بە کورتی : هەنگاوەکان بۆ بەڵگە هێنانەوە بە (پێچەوانەی ئاست) :

١. دیاری کردنی خوازراو.
٢. دیاری کردنی بناغە.
٣. بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاستی بناغە.
٤. پیادەکردنی ڕێسای (پێچەوانەی ئاست)؟
٥. ئەنجام.

## دژ پێچەوانە – پێچەوانەی دژ (عکس النقیض)

پێناسەی : بریتییە لە گۆڕینی گوتەکە بۆ گوتەیەکی تر ، بابەتەکەی (دژ)ی هەڵگیراوی گوتەی یەکەمە ، هەڵگیراوەکەشی دژی (بابەتی گوتەی دووەم)ە لەگەڵ مانەوەی (چۆن و ڕاستییەکە) .

(ابن سینا) لە (الشفاء) دا دەفەرمووێ : پێچەوانەی دژ ئەوەیە لە بەرامبەر (المحمول بالایجاب والسلب)دا بابەتێك دابنێین ، بەرامبەر (بابەت)ەکەش هەڵگیراوێك دابنێین ، واتە : ئەگەر بڵێین (هەموو پیتەکی (ح) بریتییە لە (ب) ، پێویستی و نووساوی ئەو دەبێ کە هەرچی پیتی (ب) نەبێت ، پیتی (ح) نییە .(

بواری بەکارهێنانی :

(پێچەوانەی ئاست)ی تێدا بەکاردەهێنرێت کە جۆری سێیەمە لە جۆرەکانی (لکان – التلازم) کە بریتییە لە : نووسانی ڕاستی گوتەی دووەمی خوازراوەکە بۆ سەلماندنی گوتەی یەکەم کە بەڵگەی لەسەر هێنراوەتەوە (المبرهن علها) .

مەرجەکانی :

١) گۆڕینی هەردوولای گوتەکە لەگەڵ گۆڕینی لایەکە بۆ (دژەکەی).
٢) هێشتنەوەی چۆنیەتی : واتە گوتەی نەرێنی دوای گۆڕین بە (ئەرێنی) دەمێنێتەوە ، نەرێنییەکەش هەروەها.

٣) مانەوەی سەلماندن و ڕاستی (الصدق) واتە : ڕەچاوی ئەوە دەکرێ ، کە گۆڕینی هەردوو لاکان (الطرفين) نەبێتە ئەرێنی بۆ بە دوور خستنەوەی گوتەی دووەم .

سەرەنجام : گەر مەرجەکانی ڕابردوو هاتنە دی ئەنجامەکانی (پێچەوانەی دژ – دژە پێچەوانە)ئاوا دەبێت.

١. نەرێنی هەمەکی (السالبة الكلية) : نەرێنی هەندەکی (السالبة الجزئية) پێچەوانە دەکاتەوە وەکو (لا شيء من الانسان بجماد) .

واتە : هیچ شتێك لە مرۆڤ بێ گیان نییە ، ئەو گوتە بە ڕاست دانەری ئەو گوتەیە دەڵێ : (ليس بعض الجماد بانسان) واتە : هەندێ بێ گیان مرۆڤ نییە.

٢. نەرێنی هەندەکی (السالبة الجزئية) نەرێنی هەندەکی (السالبة الجزئية) پێچەوانە دەکاتەوە (بعض المعدن ليس بحديد) واتە : هەندێ کانزا ئاسن نییە ، دەبێتە بەڕاست دانەری (ليس بعض الحديد بلا معدن) واتە : هەندێ غەیرە ئاسن غەیرە کانزا نین.

٣. (ئەرێنی گشتی) ئەرێنی گشتی پێچەوانە دەکاتەوە :

(كل كاتب انسان) واتە : (هەموو نووسەرێ مرۆڤە) دەبێتە بەڕاست دانەری (كل انسان لا كاتب) واتە : (هەرچی مرۆڤ نییە نووسەر نییە) نووسەر دەڵێ : (هیچ مرۆڤێك بەردنییە) بەڕاست دانەری (هیچ شتێك لەبەرد مرۆڤ نییە) .

٤. ئەرێنی هەندەکی پێچەوانە نابێتەوە ، چونکە بەرهەمی بەڵگە هێنانەوە لەناویدا دوا دەکەوێت بۆ نموونە هەواڵی (بعض اللاحديد معدن) ، واتە : هەندێ ئەوەی ئاسن نییە کانزایە.

پێچەوانە نابێتەوە بۆ (بعض اللامعدن حديد) واتە : هەندێ لەوەی کانزا نییە ئاسنە ، وە بۆ (كل لا معدن حديد) هەرچی کانزا نییە ئاسنە ، ئاوەژوو نابێتەوە چونکە ناڕاستن.

ڕابردوو باسکرا مەرجێکی (دژە پێچەوانە) مانەوەی ڕاستییە.

بەڵگە هێنانەوە (بەڵگەکاری ڕاستەوخۆ) (الاستدلال المباشر)

پێناسەی : هێنانەوەی بەڵگەیە لەسەر خوازراو و مەبەستەکەی (المطلوب) بەنیازی سەلماندنی.

(ئەم ڕێگایە بەکاردەهێنرێ لەو هەواڵانەدا کە لە بەکارهێنانی دا هیچ شتێك نابێتە لەمپەر و کۆسپ) ، واتە : لەو ڕێگایەنەدا بەکاردەهێنرێ کە بەکارهێنانی (بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ)ی تێدا بەکارناهێنرێت.

بابای بەڵگەهێنەرەوە ڕاستەوخۆ بەڵگە بۆ مەبەستەکە دەهێنێتەوە بەپێی ئەو هەنگاوانەی دەڕوات لەم ڕێسایەدا ڕەچاوکراون .

ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوەی ڕاستەوخۆ : ئەم ڕێگایە سێ ڕێگان :

١) پێك گرتن (قياس) .

٢) لێکۆڵینەوەو گەڕان (الاستقراء) .

٣) لێکچواندن (التمثيل) .

## پێك گرتن (القیاس)

پێناسە : (پڕاکتیك کردنی ڕێسای گشتی (القاعدة الكلیة) یە بەسەر هەندەکییەکانی (الجزئیات)دا ، بە نیازی زانینی حوکمی هەندەکی و بەشەکانی).

---

پێك گرتن (القیاس) چی یە؟

(هو قول مؤلف من اقوال ستى سلمت نزم عنها لذاتها قول آخر ، وهو :

(١) اما اقتراني : كقولنا (كل جسم مؤلف ، وكل مؤلف محدث)

(٢) واما استشنائي : كقولنا : (ان كانت الشمس طالعة فالنهار موجود) ، لكن الشمس طالعة فالنهار موجود ، ولكن النهار ليس بموجود فالشمس ليس بطالعة) .

(والمكرر) بين مقد ستي القياس فصاعدا يسمي : (حدا اوسط) و (موضوع المطلوب) يسمى : (حدا اصغر) و (محمولة) يسمى : (احدا اكبر) .

(والمقدمة) التي فيها (الاصغر) تسمى : (صغرى) ، و (المقدمة) التي فيها (اكبر) تسمى (كبرى) . وهيئة التأليف من (الصغرى) و (الكبرى تسمى (شكلا) ).

---

پێوانەی (پێك گرتن – قیاس) : (وتەییێکە) لە چەند قسەو گوتەیێك پێك دێت ، ئەگەر خۆیان ساغ و دروست بن (وتەی تر) پێك دێنن ، ( بە ئەنجام) ناسراوە.

پێواندن دوو بەشە :

(١) یەك گرتن (الاقتراني) : وەکو دەڵێن : هەموو تەنێك پێك هاتووە ، هەموو پێك هاتووێك دروست کراوەو ڕویداوە ، کەواتە : هەموو تەنێك دروست کراوەو پەیدابووە.

(٢) دەرهاوێشتە (الاستثنائي) : وەکو دەڵێین : گەر خۆر هەڵات ڕۆژ دەبێتەوە ، بەڵام ڕۆژ نەبۆتەوە بۆیە خۆرهەڵ هاتووە .

ئەوەی لە نێوان ( دووپێشەکی) ی پێواندندا ، ئەنجا بۆ سەرەوەتریش پێ ی دەگوترێ : (سنووری ناوەند – حدا الاوسط) بابەتی مەبەست (موضوع المطلوب) : پێ ی دەگوترێ (سنووری گچکە – حدالاصغر) .

وە هەڵگیراوەی مەبەست (محمول المطلوب) : پێ ی دەگوترێ (سنوری گەورە – الحد الاکبر).

(پێشەکی بچووکەکە)ی ناوی پێ ی دەگوترێ : (پێشەکی بچووك – المقدمة الصغری).

پێشەکی یە گەورەکەی ناوی پێ ی دەگوترێ : (پێشەکی گەورە — المقدمة الكبرى) شێوەو فۆڕمی پێك هاتە بچوك و گەورەکەی پێ ی دەگوترێ : (شێوە — فۆڕم) یان (شكل) .

ڕاڤە:

پێوانەی قیاس : (بریتی یە لە جێبەجێ کردنی ڕێسای گشتی (القاعدة الكلية) بەسەرهاندەکی یەکان (الجزينات)دا ، بە مەبەستی زانینی حوکمی بەشەکان و هەندەکی یەکانی).

نمونە : بۆ پیادەکردنی ڕێسای : (كل من يشرب الخمر فاسق) واتە : (هەر کەسێك شەڕاب بخواتەوە فاسقە) بەسەر (خالید)دا ، چونکە شەڕاب دەخواتەوە ، بۆ زانینی ئەو حوکمەی بەسەری دا جێ بەجێ دەکرێ ، کە (فاسقی)یە دەگوترێ : (خالد يشرف الخمر — وكل من يشرب فاسق ، فخالد فاسق) واتە : (خالید شەڕاب دەخواتەوە ، هەر کەسێك شەڕاب بخواتەوە فاسقە ، کەواتە خالید فاسقە).

یان : بۆ جێبەجێ کردنی ڕێسای : (كل ما يتمدد بالحرارة معدن) واتە : هەرچی بە گەرمایی بکشێ کانزایە ، بەسەر (ئاسندا) ، چونکە بەگەرمی دەکشێ ، بۆ زانینی ئەو یاساو حوکمەی بەسەری دا جێبەجێ دەکرێ کە (کانزایی — المعدنية) بە ، دەگوترێ : (الحديد يتمدد بالحرارة ، وكل مايتمدد بالحرارة معدن ، فالحديد معدن) (ئاسن بە گەرمی دەکشێ ، هەرچی بە گەرمایی بکشێ ئاسنە ، کەواتە : ئاسن کانزاییێکە).

ڕێسای گشتی (قاعدة الكلية) لـە نمونـەی یەکەمـدا : (كل مـن يشـرب الخمـر فاسق) (هەرچی شەڕاب بخواتەوە فاسقە)

لە نموونەی دووەم دا : (كل ما يتمد بالحرارة معدن) : (هەرچی بـە گـەرمی دەکشێ کانزایە).

بەشـە هەنـدەکی یەکـە (الجزئـي) : لـە نموونـەی یەکەمـدا : (خالیـد)ە ، لـە نمونەی دووەمدا (الحديد) ئاسنە.

ئـەو حوکمـەی لـەجێ بـەجێ کردنـی یاسـاکە سـوودی لێ دەبینرێـت : لـە نموونـەی یەکەمـدا (فاسـقی یـەتی خالیـد)ە ، لـە نموونـەی دووەمـدا (کـانزایی ئاسن)ە .

## زاراوەکانی پێك گرتن (القياس)

پێك گرتن چەند زاراوەیێکی تایبەتی خۆی هەیە ، کە ئەمانەن :

١) وێنەی پێك گرتن (صورة القياس) : بریتی یە لە شێوەو فۆڕمی پێك هاتنی (شكل التأليف) .

(پێك گرتن) لە دوو پێشەکی پێك دێ : وەکو (الحديد معدن وكل معدن عنصر بسيط) . (ئاسن کانزایە – هەموو کانزایێك توخمێکی ساکارە).

٢) پێشەکی دەگوترێ : (وێنەی پێك گرتن)ی لێوە پێك دێت ، هەوالی (القضية) : (الحديد معدن) لە نموونەی ڕابردوودا پێ ی دەگوترێ (پێشەکی) ، دیسان هەوالی (كل معدن عنصر بسيط) هەر پێ ی دەگوترێ : (پێشەکی) .

(پێشەکی) دوو بەشە : گچکە (الصغرى) و گەورە (الكبرى) :

٣) گچکە (الصغرى) ئەو پێشەکی یەیە ئەو هەندەکی یە (الجزئي) دەگرێتەوە ، کە داوای زانینی حوکمەکەی دەکات لە ڕێگای بەلگە هێنانەوە (الاستدلال)دا بەهۆی (قیاس)ەوە ، پێشەکی یەکەمی (قیاس) دروست دەبێ ، وەکو لە نموونەی (الحديد معدن)دا بینرا.

٤) گەورە (الكبرى) : ئەو پێشەکی یەیە (ڕێسای گشتی) و هەمەکی (الكلية) پێك دێنێ و بەسەر هاندەکی (الجزئی)دا جێ بەجێ دەکات بۆ زانینی

حوکمەکەی لە ڕێگای بەڵگە هێنانەوە بە پێك گرتن ، وەکو لە پێشەکی (وکل معدن عنصر بسیط) وەکو نموونە بینیمان.

٥) سنور (الحدود) : تاکەکانی دوو پێشەکییە (مفردات المقد متين) : (بابەت — الموضوع) و (هەڵگیراو — المحمول) (پێشەکی — المقد) و (پاشەکی — التالي)یە ، وەکو نموونەی (الحديد — معدن - معدن — عنصر بسيط) واتە : (ئاسن — کانزا — کانزا — توخمێکی ساکار)

٦) ئەنجام (النتيجة) : ئەو هەواڵە (القضية)یە پیّ ی دەگات دوای پیادەکردنی (گەورەکەیان) بەسەر (گچکەکە)دا ، وەکو نمونەی (الحديد عنصر بسيط) . (مانا کراوە).

٧) داواکراو (مەبەست) (المطلوب) : ئەو ئەنجامەیە پێش پیادەکردنی (گەورەکە) بەسەر (گچکە)دا دەست دەکەوێت .

## بەشەکانی پێك گرتن

١) پێك گرتنی دەرهاویشتە (الاستثنائي) : ئەو پێك گرتنەیە لە هەردوو پێشکیەکەدا بە ڕونی باسکراوە بە ئەنجامەوە یان ب دژەوە . نمونە :

١- (ان كان محمد عالما فواجب احترامه — لكنه عالم فمحمد واجب احترامه)

واتە : گەر موحەممەد زانا بێ ڕێزگرتنی پێویستە ، بەڵام زانایە کەواتە ڕێزگرتنی موحەممەد پێویتە.

٢- او كان خالد عادلا ، فهو لا يعصي الله ، ولكن قد عصى الله ما كان خالد عادلا.

واتە : یان گەر خالد دادگەر بێت ئەو سەرپێچی خوا ناکات ، بەڵام سەرپێچی خوای کرد ، خالید دادگەر نیە.

٢) پێك گرتنی یەکگرتن (الاقتراني) :

ئەو پێك گرتنەیە لە هەردووك پێشەکی یەکەیدا (ئەنجام) و (دژەکەی) باسنەکراوە ، نمونە : (العالم متغير ، وكل متغير حادث ، فالعالم حادث) ، واتە : جیهان لە گۆڕاندایە ، هەرچی لە گۆڕاندایە داهێنراوە ، کەواتە جیهان داهێنراوە.

## بەشەکانی یەك گرتن (الاقترانی) :

ئەویش بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبێت :

١. یەك گرتنی هەڵگری (الاقتران الحملي) لە هەواڵی هەڵگری (القضايا يال الحملية) پێك دێت ، وەکو : (الحمامة طائر – كل وكل طائر حيوان ، فالحمامة حيوان) واتە : (کۆتر باڵندەیێکە – هەرچی باڵندەیە گیاندارە ، کەواتە : کۆتر گیانداریێکە).

٢. یەك گرتنی مەرجی (الاقتران الشرطي) : لە هەواڵی مەرجی یە (القضایا الشرطیة) یان هەواڵی هەڵگرتن (الحملیة) و مەرجی یە (الشرطیة) پێك دێت ، نمونە :

١- (الاسم كلمة – والكلمة اما مبنیة او معربة ، فالاسم اما مبني او معرب) ، واتە : ناو وشەییێكە – وشە مەبنی یە یان موعرەبە ، كەواتە : ناویان مەبنی یە یان موعرەبە.

٢- (كلما كان الماء جار معتصما – وكلما كان معتصما كان لا ینجس بملاقات النجاسة) ، واتە : تا ئاو لێرەوا بێ پارێزراوە – تا ئاو پارێزراو بێ بە كەوتنە ناوی شتی پیس نا پاكژ نابێت) ، (كلما كان الماء جاریا – كان لا ینجس بملاقات النجاسة) ، واتە : (تا ئاو لەبەری بڕوات – بەكەوتنە ناوی شتی پیس نا پاكژ نابێت)

**پوختە: پێك گرتن**




## هەنگاوەکان بۆ بەلگە هێنانەوە بە (پێك گرتن)

(١) دیاری کردنی مەبەست (المطلوب) یان داواکراو.

(٢) پێك هێنانی (گچکەکە) لە توخمێکی هاندەکی یەکەی (کە مەبەستە حوکمەکەی بزانرێت).

(٣) پێك هێنانی (گەورەکەی) لە ڕێسای (هەموەکی) کە بەسەر هەندەکی یەکەدا جێبەجێ دەبێ دوای دلنیابوون لە ڕاستی یەکەی.

(٤) دەرهێنانی (ئەنجام) بەدەرهێنانی لە (گچکەکە) وەکو (بابەت) و لە (گەورەکە) وەکو هەڵگیراو (محمول) . وە (نوسەر) زیاتر لەسەر (قیاس) دەڕوات و شرۆڤەی دەکات و دەنووسێ :

**چوار شێوەوفۆڕمەکان (الاشكال الاربعة)**

---

والاشكال اربعة : لان (الحد الاوسط) ان كان (محمولا في الصغرى) و (موضوعا في الكبرى) فهو (الشكل الاول) وان كان (بالعكس) فهو (الرابع) ، وان كان (موضوعها فيها) فهو (الثالث) ، او (محمولا فيها) فهو (الثاني) نهذ ، هي (الاشكال الاربعة في المنطق) .

الشكل الأول : هو الذي جعل معيار للعلوم فنورده هنا ليجعل (ستورا وينتج منه (المطلوب) و ضروبه (المنتجة) الاربعة : (الضرب الاول) كقولنا : (كل جسم مؤلف فكل مؤلف محدث فكل جسم محدث).

والثاني : كقولنا : (كل جسم مؤلف ولاشيء بمؤلف بقديم ، فلا شيء من الجسم بقديم).

والثالث : كقولنا : (بعض الجسم مؤلف ، وكل مؤلف محدث ، فبعض الجسم محدض).

الرابع : كقولنا : (بعض الجسم مؤلف ، ولا شيء من المؤلف بقديم ، بعض الجسم ليس بقديم).

والقيـاس الاقترانـي : امـا : (مركـب مـن حملـتين) كمـامر وامـا (متصـلتين) كقولنـا : (ان كانـت الشـمس طالعـة فالنهـار موجـود ، وكلمـا كـان النهـار موجـودا فالارض مضيئة).

واما (مركب من منفصلتين) : كقولنا : (كل عـدد فهـو امـا زوج وفـرد وكـل زوج فهو اما زوج الزوج ، او زوج الفرد).

و (اما حمليـة ومتصـلة) كقولنـا : (كلمـا كـان هـذا انسـانا فهـو حيـوان ، وكـل حيوان جسم).

ينتـج : (كلما كان هذا انسانا فهو جسم).

واما من (حملية ومنفصلة) كقولنا : (كل عدد واما زوج واما فرد).

وكل زوج (فهو منقسم بمتساريين).

واما (متصلة) و (منفصلة) : كقولنا : (كلما كان هذا انسانا فهـو حيـوان وكـل حيوان فهو اما ابيض او اسود).

ينتـج : (كلما كان هذا انسانا فهو ما ابيض او اسود).

وامـا قيـاس الاسـتثنائي : (فـا الشـرطية) الموضـوعة فيـه ، ان كـان (متصـلة فالاستثناء عين المقد) ينتج (عيت التالي) : كقولنا (ان كان هذا انسانا فهو حيوان لكنه انسان فهو حيوان).

و (استثناء نقيض التالي) : ينتج (نقيض المقدم) كقولنا (ان كـان هـذا انسـانا فهو حيوان ، لكنه ليس بحيوان فلا يكون انسانا).

وان كان (منفصلة) : فالاستثناء عين واحد الجزئين ، ينتيج (نقيض الاخر) ، واستثناء نقيض احدهما ينتج (عين الاخر)

---

واتە :

(شێوەكان و فۆڕمەكان) چوار دانەن :

(١) ئەگەر سنووری ناوەند (الحد الاوسط) ئەگەر هەلگیراو (المحمول) بو لە (پێشەكی بچوك)دا و (بابەت) بو لە (پێشەكی گەورە) دا ئەوە دەبێتە شێوەی یەكەم (الشكل الاول).

(٢) گەر بە پێچەوانەوە ڕویدا ئەوە دەبێتە (شێوەی چوارەم).

(٣) ئەگەر لە هەردووكیاندا (بابەت) بوو ، ئەوە دەبێتە (شێوەی سێ یەم) .

(٤) ئەگەر لە هەردووكیاندا (هەلگیراو –محمول) بوو ئەوە دەبێتە شێوەی دووەم.

ئەم چوار (شێوەو فۆڕمانە) لە لۆژیكدا باسیان لێوە كراوە.

شێوەی یەكەم : كراوە بە سەنگی مەحەكی (زانستەكان) ، لێرەدا باسی دەكەین تا ببێتە ڕێساو یاسایێك ، مەبەستەو داواكراوەكەی (المطلوب) لێ دەربێنرێ و بكرێتە (ئەنجام).

چوار ئەنجام (النتیجة) ی لێوە دروست دەبن :

بەشی یەکەم : وەکو دەڵێین : (هەمو تەنێك پێك هاتووە ، هەموو پێك هاتوویێك داهێنراوە ، کەواتە هەمو تەنێك داهێنراوە).

بەشی دووەم : وەکو دەڵێن (هەموو تەنێك پێك هاتووە ، هیچ شتێکی پێك هاتوو ئاوێتە کۆن نیە ، کەواتە : هیچ بەشێك لە تەن کۆن نیە).

سێ یەم : وەکو دەڵێین : (هەندێ تەن پێك هاتوو ئاوێتەیە ، هەموو شتێکی ئاوێتەو پێك هاتە داهێنراوە ، کەواتە هەندێ تەن داهێنراوە).

چوارەم : وەکو دەڵێین : (هەندێ تەن پێك هاتووەو ئاوێتەیە هیچ شتێك لەشتی پێك هاتە کۆن نییە ، هەندێ تەن کۆن نییە).

پێوانەی یەك گرتن (القیاس الاقترانـي) : یان لە دو هەواڵی هەڵگری (الحملتین) پێك دێ وەکو باسکرا.

یان لەدوو هەواڵی بەیەکەوە نوساو (المتصلتین) پێك دێ وەکو دەڵێین : ( گەر خۆ هەلأت بوو ، ڕۆژیش بۆتەوە ، هەر کاتێ ڕۆژ بۆوە ، زەویش ڕوناك بۆتەوە ، ئەنجامەکەی ئەوەیە ، گەر خۆ هەلأتبێ زەویش ڕوناك دەبێتەوە .

یان ئەوەتا لە دو گوتە جیا و نەلکاو (المنفصلتین) پێك هاتووە : وەکو (هەموو ژمارەیێك تاقەیان بوتە ، هەموو جوتێکیش دو جوتە ، یان یەك جوتە ، کەواتە : هەموو ژمارەیەك یا تاقە (تاکە) یان دوو جوتە ، یان یەك جوتانەیە.

یان لە گوتەیەکی هەڵگری (حملیة) لکاو (المتصلة) پێك دێ : (هەر کە ئەو شتە مرۆڤ بوو ئەوە گیاندارە ، هەموو گیاندارێك تەنێکە) ئەنجامەکەی ئەوە دەردەچێت : (هەر کاتێك ئەو شتە مرۆڤێك بوو ئەوە تەنێکە).

یان گوتەیێکی لکاو (المتصلة) و نەلکاو (المنفصلة) یە ، وەکو : (هەر کاتێ ئەوە مرۆڤ بوو ئەو گیاندارە ، گیانداریش هەموو سپی ڕەنگە ، یان ڕەشە.

ئەنجامەکەی : هەرکاتێ ئەو شتە مرۆڤێك بوو ئەوە سپی یە یان ڕەشە .

پێك گرتنی دەرهاویشتەیی (الاستثنائي) : کە (مەرجی یە – الشرطية) بابەت بوو لەودا ، گەر لکێنراو (متصلة) بوو ، ئەو کاتە (دەرهاویشتنەکە) پێشەکی یەکە دەبێ و پاشەکی دەبێتە ئەنجامی ئەو ، وەکو : (ئەگەر ئەو شتە مرۆڤ بێ ، دەبێ گیاندار بێ ، بەلأم مرۆڤە ، کەواتە گیاندراە).

هەروەها دەرهاوێشتەی دژە پاشەکی : (استثناء نقيض التالي) ئەنجامەکەی : دژە پێشەکی (نقیض) دەبێت : وەکو دەڵێین : (ئەگەر ئەوە مرۆڤ بێ ئەوە گیاندارە ، بەلأم ئەوە گیاندارنییە ، کەواتە : مرۆڤیش نییە).

ئەگەر لەجۆری نەلکاو (المنقصلة) بو ، ئەوە دەرهاوێشتەی یەکێ لە بەشەکانی ، ئەنجامەکەی دژەکەی تری دەبێت ، وەکو : ئەم ژمارەیە یان جوتانەیە ، یان تاکە ، بەلأم تاکەو جوتانە نییە.

(دەرهاوێشتەی دژ) هەر کامەیان لەو دوانە ئەویتریان ئەنجام دەدات و دەبێتە ئەنجامی ئەو.

**ڕاڤە :**

بەشی یەك گرتن (الاقتراني) لە پێك گرتن (القياس) و بەپێ ی چۆنیەتی دانانی سنوری ناوەند (الحد الاوسط) لەهەردوو پێشەکی یەکەیدا بۆ چوار بەش دابەش دەبێ ، کە بە چوار شێوەکان (الاشكال الاربعة) ناسراوە.

ئەو پێشەکی یەی سنوری گچکەی (الحد الاصغر)ی تێدایە بە گچکە (الصغری) ناسراوە ، ئەو پێشەکی یەی سنوری گەورە (الحد الاکبری) ی تێدایە بە گەورە (الکبری) ناسراوە.

مەبەست لە (ناوەند) ئەو بەشەیە دەکەوێتە نێوان هەردوو لای مەبەست (المطلوب) ، وەك لە باسی (پێك گرتن – القیاس)دا ڕاڤە کراون.

شێوەی یەکەم

پێناسە : ناوەندەکە کە لەناوی دا ، لە گچکەکەدا (الصغری)دا هەڵگیراو (محمول)ە ، لە گەورەکە (الکبری)دا بابەت (الموضوع)ە .

مەرجەکانی :

تاوەکو شێوەی یەکەم بەرهەم هێنەر بێ ، جگە لە مەرجە گشتیەکانی پێشەوە ئەو مەرجانەش لەبەرچاو دەگیرێت :

(١) گچکەکەی (ئەرێنی) بێت.

(٢) گەورەکەی (هەمەکی) بێت.

بەشەکانی : گەر شێوەی یەکەم بە پێ ی مەرجەکانی بەرهەم هێنانی گشتی و تایبەتی دابین بو ، بەشەر دەرەنجەمەکانی دەبن بە چوار بەشەوە :

(١) بەشە (گچکە)کەی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێ ، بەشە (گەورە)کەی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێت ، سەرەنجامەکەی : ئەرێنی هەمەکی (الموجبة الکلیة) یە ، نمونە : (کل خمر سکر – وکل سکرا حرام ، کل خمر

حرا) ، واتە : هەموو شەڕابێ مەستکەرە — هەموو مەستکەرێ حەڕامە ، هەموو شەڕابێ حەڕامە).

دووەم : (گچکەکە) ی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێ و (گەورەکە)ی لە (نەرێنی هەمەکی) پێك دێت ، ئەنجامەکەی : نەرێنی هەمەکی (سالبة كلية) دەبێت ، نمونە : كل خمر مسكر — ولا شيء من المسكر بنافع ، لا شيء من الخمر بنافع) واتە : ( هەموو شەڕابێ سەرخۆشکەرە — هیچ شتێ لەسەرخۆشکەرەکان سوودبەخش نیە ، هیچ شتێ لە شەڕاب بە سوود نیە).

سێ یەم : بەشە گچکەکەی لە (ئەرێنی هەندەکی) پێك دێ ، بەشە گەورەکەی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێت ، سەرەنجامەکەی : ئەرێنی هەندەکی (الموجبة الكلية) دەبێت ، نمونە : (بعض المعدن الكلية) دەبێت ، نمونە : (بعض المعدن حديد — وكل حديد يتمد بالحرارة ، يعض المعدن يتمدد بالحرارة) ، واتە : هەندێ کانزا ئاسنە ، هەموو ئاسنێ بە گەرمی دەکشێ ، هەندێ کانزا بە گەرمی دەکشێت).

چوارەم : بەشە گچکەکەی (صغراة) لە (ئەرێنی هەندەکی) پێك دێ ، بەشە گەورەکەی (کبراه) لە (نەرێنی هەمەکی) پێك دێت.

ئەنجامەکەی : نەرێنی هەندەکی یە .

نمونە : (بعض الطيور لە اذنان ، ولا شيء اذنان يبيض) ، واتە : هەندێ باڵندە گوێچکەی هەیە ، هیچ شتێ نییە دوو گوێچکەی هەبێت هێلکە بکات ، هەندێ باڵندە هێلکە ناکات.

شێوەی دووەم

پێناسە : ئەو بەشەیە ناوەند (الاوسط)ەکەی هەڵگیراوە (محمول) لە هەردوو پێشەکیەکەیدا.

مەرجەکانی :

تاوەکو شێوەی دووەم بەرهەمدار بێ ، پێویستە جگە لە مەرجە گشتی یەکان ئەو دوومەرجەشی تێدا هەبێت :

(١) هەردوو پێشەکی یەکانی لە چۆنیەتی (الکیف)دا دەبێ جیاواز بن ، واتە : یەکێ (ئەرێنی) و ئەویتر (نەرێنی) بێت .

(٢) دەبێ بەشە گەورەکەی (کبری) هەمەکی (الکلیة) بێت.

بەشەکانی : گەر شێوەی دووەم مەرجەکانی بەرهەم هێنانی گشتی و تایبەتی دابین بو ، بەشەکانی دەرەنجامی بەم شێوەیە دەبێت:

١- (گچکە)کەی (ضغراە) لە (ئەرێنی هەمەکی) و گەورەکەی (کبری) لە (نەرێنی هەمەکی) پێك دێ .

ئەنجامەکەی : نەرێنی هەمەکی (سالبة کلیة) دەبێت .

نمونە : (کل مجتر ذو ظلف – ولا شیؤ من الطائر بذي ظلف ، لا شيء من المجتر بطائر) واتە : هەموو کاوێژکەرێك سمدارە ، هیچ باڵندەیێك سمدار نییە ، هیچ شتێ لەکاوێژکارەکان باڵندە نییە.

٢- گچکەکەی (الصغری) لە (نەرێنی هەمـەکی) پێـك دێ ، گەورەکـەی (الکـبری) لە (ئەرێنی هەمەکی ) پێك دێت.

ئەنجامەکەی : نەرێنی هەمەکیە.

نمونە : (لا طالب من الکمالی بناجح — وکل مجد ناجح ، لا طالب من الکمـالی بمجـد) ، واتــە : هــیچ قوتابیــەکی تەمبــەڵ دەرناچــێ ، هــەموو هــەوڵ دەری دەردەچێ ، قوتابی تەمبەڵ هەوڵ دەرنیە.

٣- بەشە (گچکە)کەی لـە (ئـەرێنی هەنـدەکی) پێـك دێ ، بەشـە گەورەکـەی لـە (نەرێنی هەمەکی) پێك دێت.

ئەنجامەکەی : نەرێنی هەندەکی یە (سالبة جزئیة)

نمونە : (بعض المعدن ذهب ، ولا شيء من الفظة بالذهب ، بعض المعدن لـیس بفضة) واتە : هەندێ کانزا زێڕ نییە ، هیچ شتێ لەزیو زێڕ نییە ، هەندێ کانزا زیو نییە.

٤- بەشــە گچــکەکەی (صــغری) لــە (نــەرێنی هەنــدەکی) پێــك دێ ، بەشــە گەورەکەی (کبری) لە نەرێنی هەمەکی پێك دێت.

ئەنجامەکەی : نەرێنی هەندەکی یە

نمونە : (بعض الجسـم لـیس بمعـدن ، وکـل ذهـب معـدن بعـض الجسـم لـیس بذهب) واتە : هەندێ تەن کانزا نییە ، هەموو زیرێك کانزایە هەنـدێ تـەن زێـڕ نیە.

شێوەی سێ یەم

پێناسـەکەی : لـەم فۆرمـەدا (ناوەنـد) لـە هـەردوو پێشـەکی یەکانـدا بابـەت (الموضوع) ە.

مەرجەکانی : سەرباری مەرجە گشتی یەکان ، ئەو مەرجانە شتی پێویستە ، تاوەکو ئەنجامی هەبێت.

١) گچکەکەی ئەرێنی بێت.

٢) دەبێ یەکێ لە پێشەکی یەکانی هەمەکی بێت.

بەشەکانی :

گـەر شـێوەی سـێ یـەم (مەرجـەکانی بەرهـەم هێنـانی گشـتی) و (تایبـەتی) هەبو ، بەشە بەرهەمدارەکانی بەم شێوەیە دەبێت.

١- گچکەکەی (صغری) لە ئەرێنی هەمەکی پێك دێ ، گەورەکەی (کـبری) هـەر لە ئەرێنی هەمەکی (موجبة کلیة) پێـك دێـت ، بەرهـەم و ئەنجامەکـەی : ئەرێنی هەندەکی (الموجبـة الجزئیـة) دەبێـت ، وەکـو : (کـل ذهـب معـدن ، وکل ذهب غالي الـثمن ، بعض المعـدن غـالي الـثمن) واتـە : هـەموو زێڕێـك کانزایە ، هەموو زێڕێك گرانبەهایە ، هەندێ کانزا گرانبەهان) .

٢- گچکەی لـە (ئـەرێنی هەمـەکی ، و گەورەکـەی لـە (نـەرێنی هەمـەکی پێـك دێ).

بەرهەم و ئەنجامەکەی : ئەرێنی هەندەکی یە .

وەکو : (کل ذهب معدن ، ولا شيء من الذهب بفضة ، بعض المعدن ليس بفضة) واتە : هەموو زێرێك کانزایە ، هیچ شتێ لەزێڕ زیو نییە ، هەندێ کانزا زیو نییە.

سێ یەم : گچکەکەی لە ئەرێنی هەندەکی و گەورەکەی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێت.

ئەنجام : ئەرێنی هەندەکی یە (موجبة جزئية)

نمونە :

(بعض الطائر ابيض ، وكل طائر حيوان ، بعض الابيض حيوان) ، واتە : هەندێ باڵندە سپییە ، هەموو باڵندەیێك گیاندارە ، هەندێ سپی یەکان گیاندارن.

٤- گچکەکەی لە ئەرێنی هەمەکی پێك دێ ، (گەورەکەی) لە ئەرێنی هەندی پێك دێت.

ئەنجام : ئەرێنی هەندەکی یە

نمونە : (كل طائر حيوان ، وبعض الطائر ابيض ، بعض الحيوان ابيض) ، واتە : هەموو باڵندەیێك گیاندارە ، هەندێ باڵندە سپین ، هەندێ گیاندار سپین.

٥- (گچکەکە)ی لە (ئەرێنی گشتی) پێك دێ ، (گەورەکە)ی لە (نەرێنی هەندەکی) پێك دێت.

ئەنجام : نەرێنی هەندەکی یە .

نمونە : (کل حیوان حساس ، وبعض الحیوان لیس باسنان بعض الحساس لیس بحیوان)

واتە : هەموو گیانداران هەستیارن ، هەندێ گیاندار مرۆڤ نین ، هەندێ هەستیار گیاندارنین.

٦) (گچکەکە)ی لە (ئەرێنی هەندەکی) و (گەورەکە) ی لە (نەرێنی هەمەکی) پێك دێت.

ئەنجام : نەرێنی هەندەکی یە

وەکو :

(بعض الذهب معدن ، ولا شیء من الذهب بحدید ، بعض المعدن لیس بحدید)

واتە : (هەندێ زێر کانزایە ، هیچ شتێ لەزێڕ ئاسن نیە هەندێ کانزا ئاسن نیە)

شێوەی چوارەم

پێناسە : لەم شێوەیەدا ناوەند (الاوسط) تێ یدا لە گچکەکە (الصغری) دا (بابەت)ە لە گەورەکە (الکبری) دا (هەلگیراو)ە.

مەرجەکانی :

تاوەکو شێوەی چوارەم ئەنجام و بەرهەمی هەبێ ، جگە لە مەرجە گشتی یەکان دەبێ ئەو مەرجانەش هەلگرێت.

١) یەکێ لە پێشەکی یەکانی (نەرێنی هەندەکی) بێت .

٢) گەر دوو پێشەکی یەکانی ئەرێنی بن دەبێ (گچکەکە)ی هەمەکی بێت.

بەشەکانی :

گەر شێوەی چوارەم مەرجە بەرهەممدارە گشتی یەکان و تایبەتی یەکانی تێدا هاتە جێ ، بەشەر بەرهەممدارو ئەنجامەکانی بەم شێوەیە دەبێت:

١- گچکەکەی واتە (الصغری) کە مەبەست ئەو پێشەکی یەیە گچکەکەی تێدایە ، لە ئەرێنی هەمەکی پێك دێت ، وە گەورەکەی (الکبری) کە مەبست ئەو پێشەکی یەیە (المقدمة) گەورەکەی تێدایە ، لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك بێت .

ئەنجامەکەی : ئەرێنی هەندەکی یە

نمونە : (کل انسان حیوان – وکل ناطق انسان ، بعض الحیوان ناطق) واتە : هەموو مرۆڤێك گیاندارە ، هەموو قسەکەرێك مرۆڤە ، هەندێ گیاندار قسەکەرن .

٢- گچکەکەی (الصغری) لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێ و گەورەکە (الکبری) لە (ئەرێنی هەندەکی) پێك دێت.

ئەنجامەکەی : ئەرێنی هەندەکییە :

نمونە : (کل انسان حیوان ، وبعض الولود انسان ، بعض الحیوان ولود) ، واتە : هەموو مرۆڤێك گیاندارە ، هەندێ لەدایك بوو مرۆڤە هەندێ گیاندار لە دایك دەبن.

٣- (گچکەکە)ی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێک دێ ، گەورەکەی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێ.

ئەنجام : نەرێنی هەمەکی یە .

نمونە : ( لا شيء من الانسان بجماد ، وكل ناطق انسان ، لا شيء من الجماد بناطق)

واتە : هیچ شتێ لە مرۆڤ بێ گیان نییە ، هەموو قسەکەرێ مرۆڤە ، هیچ شتێك لەبێ گیان قسەکەر نیە.

٤) (گچکەکە)ی لە (ئەرێنی هەمەکی) پێك دێ ، و گەورەکەی لە (نەرێنی هەمەکی) پێك دێت.

ئەنجام : نەرێنی هەندەکییە.

بۆ نمونە : (كل سائل يتبخر – ولا شيء من الحديد سائل وبعض ما يتجر ليس بحديد) واتە : (هەموو شلەیێك دەبێت بە هەڵم ، هیچ شتێ لە ئاسن شلە نییە ، هەندێ لەوەی دەبێتە هەڵم ئاسن نییە).

٥- (گچکەکە)ی لە ئەرێنی هەندەکی پێك دێ ، (گەورەکە)ی لە (نەرێنی هەندەکی) پێك دێت.

نمونە :

(بعض السائل یتبخر ، لا شيء من الحدید سائل ، بعض ما یتبخر لیس بحدید) ، واتە : (هەندێ شلە دەبێتە هەڵم ، هیچ شتێ لە ئاسن شلە نی یە ، هەندێ لەوەی دەبێتە هەڵم ئاسن نییە).

تێبینی : بەشەکانی ترمان لە ڕاست پێك گرتن ڕابردو باس کردووەو دوبارەی ناکەینەوە .

## گرنگی پێك گردن و قیاس

لەو ڕوونکردنەوەی ڕابردوودا بۆمان دەرکەوت قیاس و پێك گرتن چەند گرنگە ، کە چۆنیەتی پڕاکتیکە زانستی یەکانمان فێردەکات ، بۆ بەدەست هێنانی ئەنجامە مەبەستەکان ، بەو پێ و دانگە دەتوانین بڵێین : قیسا هەموو ئەو هەل و بوارانە دەگرێتەوە بەسەر ڕێسا گشتی یە پراکتیکی یەکاندا جێ بەجێ دەبێت.

## تێ گەڕان و لێکۆڵینەوە (الاستقراء)

وشەی (الاستقراء) واتە : (التتبع) شوێن کەوتن ، سۆراغ ، بەدواداگەڕان ، تێ گەڕان.

لە کتێبی (الملتقطة) دا هاتووە لە (المنطق)دا : (الاستقراء) بریتی یە لە گەڕان و سۆراغ بەدوای حوکمی هەندەکی یەکاندا (حکم الجزئیات) بۆ بەدەست

هێنانی حوکمە هەمەکیەکان (حکم الکلیات) ئەم سۆراغ و تێ گەڕانە (الاستقراء) دەبێ بەدوو بەشەوە :

١- تێ گەڕانی تەواو (الاستقراء التام) : سۆراغ و تێ گەڕانە بە شوێن هەندەکی یە گشتی یەکان بۆ زانینی بۆ نمونە : (کل حیوان اما ناطق او غیر ناطق ، وکل ناطق حساس ، وکل غیر ناطق من الحیوان حساس ، ینتج کل حیوان حساس) واتە : (هەموو گیانداری یان قسەکەرە یان قسەکەر نیە ، هەموو کەری هەستیارە ، هەموو قسە نەکەری لە گیانداران هەستیارە) ، ئەنجام : هەموو گیانداری هەستیارە ، ئەم بەشەیان یەقین و دڵنیایی دەبەخشێت ، بەلأم تێ گەڕانی ناتەواو (الاستقراء غیر تام) تەنیا سۆراغی زۆربەی هەندەکی یەکان دەکات ، وەکو (کل حیوان یحدك فکە الاسفل عند المضغ) واتە : هەموو گیانداران لەکاتی جویندا شوێلگەی ژێرەوە دەجولێنن ، چونکە کاتێ سۆراغی مرۆڤ و گیانداران و دڕندەکان و هی تر کراوە ئاوا بوون ، ئەم بەشەو دڵنیایی نادات ، چونکە دوورنیە گیانداری تر هەبێ بەم شێوەیە نەبێت وەکو لەبارەی (تیمساح) بیستومانە ، بەلگە هێنانەوە لەم ڕێگایەوە (الاستقراء) بەسێ قۆناغ دەبێت :

بەلگە هێنانەوە لەم ڕێگایەوە (الاستقراء) بەسێ قۆناغ دەبێت :

١) قۆناغی تێبینی و ئەزموون کردن

٢) قۆناغی گریمانکاری

٣) قۆناغی یاسا

بێگومان ئەم ڕێگایە زۆر گرنگە لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی دا ، دانانی بناغە زانستی یە گشتی یەکان لەسەر ئەوە دا دەمەزرێت ، بۆ نمونە : زانای فیزیایی ناتوانێ ڕێسا و یاساکانی (زانستی فیزیایی) لە ڕاست دیاردەییێکی سروشتی دا بدۆزرێتەوە تا تەواوی هەندەکی یەکانی ئەو دیاردەیە سۆراغ نەکات کە دەیەوێ چەند یاسایەکی گشتی لەو بارەیەوە ببەخشێت دیسان (زانستی ڕێزمان) بەو تێ گەڕانە ڕێسا گشتی یەکانی دەدۆزرێتەوە ، واتە دەبێ سۆراغی هەموو وشەو ڕستەکان بکرێ لە هەموو ئەو شتانەی لە زمانی کوردی و عەرەبیدا بە نموونە بەکاردێنرێت ، زانستەکانی تریش ئاوەها.

کەواتە : (الاستقراو) یان سۆراغ و تێ گەڕان ئەو ڕێسایە گشتی یانەمان پێ دەدات لە جێبەجێ کردنی زانستی دا بەکاریان دێنین لە ڕێگای (پێك گرتنەوە) بۆ زانینی حوکم و یاسایە هەندەکی یەکان (الجزئیات).

ئا لێرەدا گرنگی پەیوەندی (الاستقراء) و (القیاس) مان بۆ دەردەکەوێت.

(د.جمیل صلیبا) دەنوسێ : (الاستقراء) واتە : (التتبع) واتە : شوێن کەوتن و سۆراغ ، لای لۆژیکیەکان بریتی یە لە حوکم دان لەسەر هەمەکی بەدۆی سەلماندنی ئەم حوکمە بە سەر هەندەکی دا ، (خوارزمی) دەڵێ : (الاستقراء) بریتی یە لە ناساندنی شتێکی هەمەکی بە هەموو کەسەکانیەوە.

دەڵێ : (الاستقراء) دوو بەشە :

(١) تەواو کە بە قیاسی (المقسم) یان (استقراء الصوري) ناسراوە ، (ئەرستۆ) ڕونی کردۆتەوە بریتی یە لە حوکم دان لەسەر ڕەگەز ، چونکە هەموو

جۆرەکـانی دا ئـەو حوکمـە هەیـە ، وە (الاسـتقراء الرياضـي) واتـە : تـێ گەڕانی ماتمـاتیکی ، ئـەویش بەشـێکە لـە قیاسـی تـەواو کـە بریتـی یـە لـە گواستنەوە بە تایبەتی یە وە بۆ گشتی ، یان لە گشتی یەوە بۆ گشتی تر .

(٢) هەرچی تێ گەڕانی ناتەواوە (الاستقراء الناقص)ە حوکم واتە لە سەر گشتی بەهۆی حوکم دان لەسەر بەشێ لە هەندەکیەکانی .

نمونـە : قـەبارەی هـەموو گـازێ چـونیەکە ، ئـەو فشـارەی دەفرێتـە سـەری چونیەکی یەکی پێچەوانەیە ، چونکە هایدرۆجین و ئۆکسجین و ئازۆن و ئەوانی تر ئەوە دەردەخات[٤٤].

## پێك چواندن (التمثيل)

پێناسە :

ئـەو بەلگەیەیـە حـوکمی هەنـدەکی (جـوزئی) پـێ دەسـەلمێ ، چـونکە لـە هەندەکی تردا سەلماوە ، کە هاوشێوەی ئـەوە وەسفێکی هاوبەشیان هەیـە ، ئـەم بەشەیە لای زانایانی (لۆسولی فیقهی ئیسلامی) بە (قیاس) ناسراوە.

هەندەکی یەکە پێ ی دەڵێن : (لق – فەرع) ، هەندەکی دووەم پێ ی دەڵێن (بناغـە – ئەسـڵ) سـیفەتی هاوبـەش لـە نێوانیانـدا پـێ ی دەگـوترێ هۆکـار (عیللەت) نمونە : (النبيذ حرام ، لان الخمر حرام) واتە : بیرە حەرامە ، چونکە شـەڕاب حەڕامـە ، هۆکـار (عیللـەت) سەرخۆشـکردنە (الاسـکار)ە ، کـە لەبیرەشـدا هەیە ، بۆیە حەڕامە.

[٤٤] المعجم الفلسفي / د.جميل صليبا / ج١ ، ل:٧٢.

کەواتە : لێرەدا پێویستە سێ پێشەکی هەبێت:

١) حوکم لە ئەسڵدا دابمەزرێت.

٢) هۆکارو عیللەتی حوکم لەئەسڵدا وەسفی هاوشێوە بێت.

٣) ئەو وەسفە لە فەرعیشدا هەبێت.

بەم شێوەیە دەبینین (التمثیل) لە بۆچوونی مەزهەبە فیقهی یەکاندا بەسەرچاوەیێکی تەشریعی ئیسلامی دادەنرێت ، کە بە (قیاس) ناسراوە.

پەیوەندی (ئوسولی فیقهی) بە لۆژیکەوە بێگومان (ئوسولی فیقهی) زانستێکە لەنێوان (دەق) و (هزر) وایە ، پشت بەستنی بەهزر ، پەیوەندی لەگەڵ لۆژیکدا بەهێز دەکات ، چونکە لۆژیك زانستێکی هزرییە ، بەو پێیە هزر (عەقڵ) دەبێتە هاوبەش لە نێوانیاندا ، (غەزالی) زانستەکان بەسەر (زانستی عەقڵی و نەقڵی و پەیوەندی هاوبەش لە نێوانیاندا) دابەش دەکات ، بە سێ سێ یەمیان (ئوسولی فیقهی) پێك دێنێت

وە (الشاطبي) پێ ی وایە : ئەم زانستە لە نێوان بەڵگەی نەقڵی و عەقڵی دایە ، بەلاّم (نەقڵ)ەکە هەنگاوێك لە پێش عەقڵەوەیەوە دەکەوێتە پێشی یەوە ، دەڵێ : (هەموو بەڵگەیێکی شەرعی لەسەر دوو پێشەکی دادەمەزرێ ، یەکێکیان دەگەڕێتەوە سەر هێنانەدی شوێنی پێوە بەستانی حوکم (مناط الحکم) دووەمیان دەگەڕێتەوە سەر خودی (حوکم) ، یەکەم تیوری یە کە مەبەست لە غەیری نەقڵەکەیە ، کە زەرورەت دابمەزرێ یان بە هزرو وردبوونەوە) لە ڕاست پێش خستنی نەقڵ بەسەر عەقڵدا دەڵێ : (بەڵگە هزرییەکان گەر لەم زانستەدا

بەکارهێنران ئەوە بە تێکەڵاوی لەگەڵ بەڵگەی بیستراو یان دیاری کراو لە ڕێگاکەیدا بەکاردێنرێت).

(عەقڵ) لە ئوسوڵی فیقهی دا ڕۆڵەتی باڵای هەیە ، بە (ئەسڵی چوارەم) دێ لە بەڵگە شەریعەتی یە کاندا ، کە لە قیاسدا خۆی دەنوێنێت ، واتە (پێك گرتن) کە بناغەی لۆژیکە ، دیسان بناغەیێکیشە لە ئوسوڵی فیقهی دا.

شافیعی لە (الرسالة) دا دەڵێ : کەس بۆی نیە بە شتێ بڵێ حەڵاڵە یان حەرامە لە ڕوی زانستەوە نەبێ ، زانست مەبەست هەواڵی قورئان و سوننەتە ، یان ئیجماعە ، یان قیاس و پێك گرتن[45].

(غەزالی) لە کتێبی (میزان العمل) دا (ل: ٥٩-٦٠) دا دەنوسێ (لۆژیك وەکو پێوەرو تەرازوویێکە بۆ گشت زانستێك ، گەر بە تەرازو نەکێشرێن ، قازانج و زیان و هاوسەنگی و لاسەنگی یەکەی نازانرێت) وە لە کتێبی (معیار العلم/ ل: ١١٦)دا پێ ی وایە پێك گرتنی لۆژیکی ئەرستۆیی یان (قیاسی بەڵگە – قیاس البرهان) مرۆڤ دەگەیەنێتە یەقین ، هەرچی قیاسی پێك چواندنە (قیاس التمثیل) یان قیاسی ئوسوڵی ، مرۆڤ لە گوماندا دەهێڵێتەوەو مرۆڤ بە یەقین ناگەیێنن ، چونکە پێشەکی گەورە (المقدمة الکبری) تێ یدا گومانی یە ، حوکمی گوازراوە (الحکم المنقول) سێ بەشە : یان حوکمێکی هەمەکی یە دەدرێ بەسەر هەندەکی دا ئەمەیان ڕاستە ، پێوەرێکی دروستە ، بەڵام حوکمی هەندەکی (جوزئی) بۆ سەر هەندەکی ئەوە پێك چواندنە (التمثیل) ، وە حوکم دان لە

[45] بڕوانە (المنطق واصول الفقه / ل : ١٥١ ، ١٥٢ / بەکورت کردنەوە.

هەندەکی زۆرەوە بەسەریەك هەندەکی دا ئەوە تێ گەڕان و سۆراغە (الاستقراء) کە لە پێك چواندن (التمثیل) بەهێزترە ، بەلاّم هەندێ لە فەقیهانی سوننی هاوچەرخ و فەقیهانی شیعە ، ڕای (ابن تیمیە) بە پەسەند وەردەگرن لە ڕاست لۆژیکی ئەرستۆدا.

(ابن تیمیة) پێ ی وایە (یەقین) لە قیاس و پێك گرتنی وێك چواندن (التمثیل) دا لە قیاس و پێك گرتنی بورهانی ئەرستۆیی بەهێزترە ، چونکە حوکم لە هەندەکی دا حوکمێکی نەگۆڕە ، لە ڕاستی دا هەندەکی لە ئارادابوونی راستەقینەی هەیە ، هەرچی قیاسی بەلگەیی و بورهانی یە لەسەر پێشەکی یەك (المقدمة) دادەمەزرێ ، کە سوود لە پێك گرتنی وێك چواندن (القیاس التمثیل) وەردەگرێت[٤٦]

بێگومان جەماوەری ئوسولی ئەهلی سوننەو زۆر لە موعتەزیلەکان و زەیدییەکان پێك گرتن (قیاس) بە ئوسولی چوارەمی تەشریعی دەزانن ، هەرچی زاهرییەکان و ئیمامی یە کانن بە بەلگەی دانانێن.

بۆ نمونە : ئیمامی یەکان دەلێن : کاتێ خوا بە شەیتانی فەرموو کوڕنوش بۆ ئادەم ببات پەنای بۆ قیاس بردوو ووتی : (انا خیر منە خلقتني من نار وخلقتە من طین) (الاعراف ١٤) ، بەلاّم جمهوری سوننە دەلێن : ئەم قیاسە لەبەرامبەر دەقدا بووە ، هیچ کاتێك کەس نەیگوتووە لەبەرامبەر دەقدا قیاس

---

[٤٦] بڕوانە کتێبی (العقل والشریعة) ، و: مهدی فضل الله / ل: ٣٤- ٣٥ ، بەکورت کردنەوە.

ڕەچاو دەکرێت و دەکرێت بە بەڵگە ، بەڵکو لە کاتێکدا دەکرێ بە بەڵگە گەر دەقێك نەبوو.[٤٧]

هاوکات وەکو شێخ (محمد ابو زهرة) فەرموویەتی : ئیمام جەعفەری سادق مەرجەعی ئوممەی ئیسلامی و ئال و بەیت سەلامی خوایان لێ بێت ، ئیمام لە فەرموودەزانی دا کەس خۆی لە قەرە نەداوە ، لە لوتکەدا بوو ، لە بڵندایی زانایانی فیقهی دا بوو ، لە (فیقهی فەرموودەیی)دا ، ڕای خۆی هەبووە لە (عەقیدە)دا وەچەکانی سەردەمی خۆی بە فکرەکانی خۆی ئاودێرکردووە ، ڕاوی فەرموودە بووە ، لە هەڵێنجان (الاستنباط) فرە زانابوە ، ڕای لادەرانی عەقیدەکانی ڕاست کردۆتەوە لەڕاست (قەدەر) و (ویستی مرۆڤ) قسەی کردووە ، وە لە ڕاست (یەکتاپەرستی) و ڕوکنەکانی دواوە ، لە ڕێگاکانی هەڵێنجانی فیقهی دواوە)[٤٨]

وە دەفەرمووێ : (ئیمام سادق –علیه السلام- مامۆستای مالیك و ابو حەنیفەو سەفیانی کوڕی عویینە) بووە[٤٩].

دیسان شافیعی فیقهی خۆی لە ئال و بەیت وەرگرتووە ، وەکو (ابو زهرة) فەرموویەتی : شافیعی ناسراوبوو بە ویلائی بۆ ئال و بەیت بۆیە تۆمەتبار کراوە ، ئەو دەیگوت : ( ان كان رفضاحب ال محمد فليشهد الشقلان اني رافضي)

---

[٤٧] بروانە (اصول الاحكام / أ.د. حمد عبيد كبيسي / ل: ١١١.

[٤٨] تأريخ المذاهب الاسلامية / الامام محمد ابو زهرة / ل: ٦٩٧.

[٤٩] س.پ / ل: ٧٠١.

بۆیە کۆت و زنجیرە کراوە بۆ بەغداد براوە ، توانیویەتی بە زیرەکانە خۆی لە دەست هارون رەشید رزگار بکات)[50].

وە شافیعی دەستی گرتووە بە قورئانەوە ، پاشان سوننەتی سەحیحی لە ئاستی قورئاندا دانەناوە لە عەقیدەدا ، سوننەتی بە بەیان داناوە ، گوتویەتی بە سوننەت ئایەت نەسخ نابێتەوە ، وە بڕوای بە (قیاس) و (الاستقراء) هەبووە ، کاری پێ کردووە ، وەکو (شێخ محمد ابو زهره) ڕونی کردۆتەوە ، وە بڕوای بە سوننەتی ئال و بەیت و مەرجەعی یەتی ئەوان بووە .

لە (الجمع الجوامع) دا هاتووە : شافیعی لەناو وتەی ئەسحاب دا تەنیا وتەکانی ئیمام عەلی بە بەلگە (الحجة) وەرگرتووە : (وعن الشافعي الاعليا) و بەسەر وتەی ئەسحابی تردا فەرزی کردووە [51] چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (فلا تعلموهم فانهم ، علم منكم) کەواتە : لۆژیك و قیاس لە ئال و بەیت وەرگیراوە ، ناکرێ بەشتێکی دور لە بازنەی فیقهی بەدەربکرێت ، قیاس دژ بە ئایەت و فەرموودە نییە .

(عبدالرحمن الشرقاوي) دەنوسێ : ئەحمەد زۆر فیقهی عەلی بەدڵ بووە کردوویە بە بەلگەو بلاوی کردۆتەوە ، هەرچەند پادشایانی هەبباسی پێیان ناخۆش بووە[52] .

پاشان (ابو حنيفة) توانیویەتی لە ڕێگای قیاسەوە مەبەستەکانی شەریعە ئاوەڵە بکاتەوە (پێ ی وابووە قیاس مەقاسیدی شەریعە ئاشکرا دەکات ، ئەحکامەکان ڕاستر پیشان دەدات ، لەوە ڕاسترە پشت بە فەرموودەی نادروست

[50] س.پ. / ل: ٤٣٧.

[51] الغيث الهامع / الحافظ العراقي / ل : ٦٥١.

[52] ائمة فقه التسعة / عبدالرحمن الشرقاوي / ل: ١٧٥.

ببەستێ ، و قیاس چەند یاسایەکی هەیە ، کە بەرژەوەندی دێننە دی ، ئەمەشە ئامانجی شەریعەت)[٥٣] .

هەروەها شێخ (محمد ابو زهرة) باس لە باپیرەی ئەبو حەنیفە دەکات ، ناوی (زوتی) بووە ، خەڵکی ولاّتی فارس بووە ، قوتابی ئیمام عەلی بووە ، لە کوفە بە دیداری شاد دەبێ و ویلائی بۆ ئەو دەبێت ، دیاری نەوروز بۆ ئیمام دەبات ، ئەمەش دوعای بۆ کردووە بەرەکەت بخاتە وەچەکەیەوە.[٥٤]

گومانی تێدا نییە ، کاتێ ئیمام جەعفەر سادق ئامۆژگاری ئەبو حەنیفەی قوتابی دەکات ، کە یەکەم کەس قیاسی کردبێ ، شەیتان بووە ، لەبەرامبەر قورئان و دەقێکی سوننەتی ڕاست و رون دا ، ئەویش لە سنووری ئەو نەخشەیەی سادق بۆی داناوە جولاّوەتەوە .

ئەبو حەنیفە عەرەبە ڕەگەز پەرستەکان دژایەتی یان کردووە ، حەزیان نەکردووە کەسێکی غەیرە عەرەبی زانا لەناویان هەڵکەوێت ، دیسان عەبباسییەکان دژایەتی یان کردووە چونکە سەر قوتابخانەی ئال و بەیت بووە ، وەکو (عبدالرحمن الشرقاوي) باس دەکات لە مەدینە قوتابی سادق بووە ، بە پاوە وەستاوەو گوتویەتی (يا بن رسول الله لا يراني الله جالسا وانت واقف)[٥٥] واتە : ئەی ڕۆڵەی پێغەمبەری خوا نابێ خوا بەدانیشتنەوە من ببینێ و تۆش بە پاوە وەستابیت.

وە شافیعی (رض) لە کتێبی (الرسالة) دا دەڵێ : لەکاتێ دا کار بە قیاس دەکرێ ، کە دەقێکی قورئان و سوننەت و ئیجماع لە ئارادا نەبێت ، گەر دەقێکی

---

[٥٣] س.پ. / ل: ٦٤.

[٥٤] تأريخ المذاهب الاسلامية / ل: ٣٤٩ سەیر بکە.

[٥٥] ائمة فقه التسعة / ل:٥٦.

قورئان هەبوو دەڵێین ئەوە حوکمی خوایە ، گەر سوننەت هەبوو دەڵێین حوکمی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیە وسلم) نەك قیاسە ، وە قیاس ئیجتیهادە..)[٥٦] .

[٥٦] بروانە الرسالە / للشافعی / ل: ١١٠.

## پێنج هونەریەکان (الصناعات الخمس)

(١) البرهان : وهو قياس مؤلف من المقد مات اليقينية لا نتاج (اليقين).

واليقينات ستة اقسام :

١. اوليات : كقولنا (الواحد نصف الاثنين) و (الكل اعظم من الجزء).

٢. المشاهدات : كقولنا (شرب مشرقة) (النار محرقة).

٣. المجربات : كقولنا (شرب السمقونيا مسهل الصفراء)

٤. الحدسيات : كقولنا (نور القمر مستفاد من الشمس).

٥. متواترات : كقولنا محمد (صلى الله علية وسلم) او على النبوة واظهرت المعجزة).

٦. وقضايا قياساتها معها : كقولنا (الاربعة زوج بسبب وسط حاضر في الذهن وهو الانقسام بمتساويين.

(٢) الجدل : وهو قياس مؤلف من مقدمات مشهورة .

(٣) الخطابة : قياس مؤلف من مقدمات مقبولة من شخص معتقد فيه او مظنونة.

(٤) والشعر : وهو قياس مؤلف من مقدمات تنبسط منها النفس او تنقبض.

(٥) المغالطة : وهو قياس مؤلف من مقدمات كاذبة شبيهة بالحق او بالمشهور او من مقدمات وهمية كاذبة ، والعمدة هو (البرهان).

وليكن هذا اخر الرسالة في (المنطق)

---

واتە :

(١) بەڵگە (بورهان – ئەرگۆمێنست) پێك گرتنێكە (القياس) لە چەند پێشەكی یەكی یەقینی و دڵنیا بەخش پێك دێ بۆ ئەنجامدانی (یەقین).

پێشەكی یە یەقینییەكان شەش بەشە :

١. بەرایی یەكان (اوليات) : وەك بڵێین : یەك نیوەی دووە ، هەمەكی لە هەندەكی زۆرترو گەورەترە.

٢. بەرچاوەكان (بینراوەكان – المشاهدات) : وەكو بڵێین : (خۆر درەوشاوەیە) (ئاگر داخكەرە).

٣. تاقی كراوەكان : وەك بڵێین (خواردنەوەی سەقمونیا زەرداو ناهێڵێت و چاكی دەكاتەوە).

٤. زەین ڕوونی (الحدسيات) وەكو بڵێین : تریفەی مانگ سود لە ڕوناكی وەردەگرێت.

٥. تەواتورەكان : وەك بڵێین موحەممەد (سەلامی خوای لەسەر بێت) داوای پێغەمبەرایەتی كردووە ، موعجیزە لە سەردەستیدا ڕویداوە.

٦. ئەو هەوالآنەی (القضایا) (پێك گرتن) لەناو خۆیاندا هەیە ، وەکو : چوار جوتانەیە ، چونکە لە زەینماندا هەیە بە یەکسانی دابەش دەبێت .

(٢) دەمەقالێ (الجدل) جۆرە پێك گرتن و قیاسێکە لە چەندان پێشەکی ناسراو پێك دێت.

(٣) (الخطابة) یان وتاربێژی : جۆرە پێك گرتنێکە لە چەندین پێشەکی پەسەند کراو پێك دێ ، کە لە کەسێکەوە بڕوا بە قسەکانی بکرێ یان گومانی ڕاستی یان لێ بکرێت .

(٤) شیعرو هەڵبەست : پێوەرێکی چەند پێشەکی دارە ، لەو ئاستەدا دڵ بکەنەوە یان تەنگی بکەن.

(٥) هەڵەسازی (المغالطة) پێوەرێکە لە چەندان پێشەکی درۆو نادروست پێك دێ ، بە ڕاستی دەچن ، یان ناسراون یان لە چەندان پێشەکی وەهمی ناڕاست پێك دێن ، ئەم پێوانە بە (سەفسەتە) ناسراوە ، بەلاَم بەلگەو ئەرگومێنت جێگای پشت پێ بەستنەو یەقین دەبەخشێت ، ئەمەش کۆتایی ئەم نامیلکەیەیە لە زانستی لۆژیکدا.

---

**ڕاڤە :**

مەبەست لە (الصناعات الخمس) پێنج هونەرەکانە ، (بەلگە و ئەرگومێنت) و (البرهان) دەمەقالێ (الجدل) و وتاربێژی (الخطابة) و هەڵبەست (الشعر) و هەڵەسازی (المغالطة) یە ، کە بە (السفسطة) و (المشاغبة)ش ناسراوە .

وەکو باسکرا ، کە (پێوانەدن) لە ڕووی فۆڕم و شێوەوە بۆ هەلاوێردان (الاستپنائی) و یەك گرتن (الاستقرائي) دابەش دەبێت ، بەلام لە ڕوی ماددەو کەرستەوە بۆ پێنج بەش دابەش دەبێت کە بە (الصناعات الخمس ناسروان) .

بەلگە (البرهان) : پێوەرێکە لە چەندان پێشەکی یەقین بەخش پێك دێ ، بۆ بە دەست هێنانی یەقین ، یەقینی یەکان یان بەلگە نەویستن (البريهيات) یان تیۆرین (النظريات) یان سەر دەکێشن بۆ چەند بەلگە نەویستێك لە بەرنەمانی (دەوری) و زنجیرە بەندی (التسلسل) .

لێرەدا (بورهان) یان (بەلگە) بەهێزترینیانە ، چونکە ڕاستی یەکان دەسەلمێنن و مرۆڤ بە یەقین شاد دەکەن.

دەمەقالێ (الجدل) بە پلەی دووەم دێ ، توانای سەلماندن و نەسەلماندنی نییە ، بەلام دوژمن دەم کوت دەکات .

وتاربێژی (خەتابە) بە پلەی سێ یەم دێ چونکە بە ڕاست دانانێکی چەسپیو نابەخشێت ، ئەو هونەرە زیاتر وتاربێژان و سیاسەتمەداران بۆ ڕاکێشانی جەماوەر بەکار دێنن .

(شیعرو هەلبەست) بە پلەی چوارەم دێن ، چونکە دلنیایی نادەن ، تەنیا چەند هەلچونێکی دەروونی دەبەخشن.

هەلەسازی (المغالطة – السفطة) تەنیا گوێڕایی و سەلێشێواوی دەبەخشن ، جار هەیە هەلەکە لە زماندایە ، جار هەیە لەماناداییە .

وەکو باسکرا یەقین بەخشەکان (الیقینیات) یان بەڵگە نەویستەکان پێنج بەشە :

بەرایی یەکان (البدیهیات) ئەو وتەو هەلآنەیە هزر بەوێنا کردنیان دەیانزانێ ، وەکو (هەمەکی لە هەندەکی گەورەترە).

بەرچاوەکان (المشاهدات) کە بە (المحسوسات)یش ناسراوە ، واتە : بەرجەستەکان و هەست پێ کراوەکان ، ئەمانە بە پێنج هەستەکان دەزانرێت ، وەکو (النار حار) واتە : ئاگر گەرمە یان (الطعام مر) خواردنەکە تاڵە ، بەلآم هەستی دەروونی (الحسس الباطني) بە (ویژدانیەکان) ناسراوە ، وەکو هەست کردن بە (برسێتی) و (تینوەتی) و (تورەیی).

هەرچی تاقی کردنەوەکانن ، بە ئەزمون و تاقی کردنەوە دەزانرێن ، وەکو (الجماعة تقوی للانسان) سیواك بۆ ددان بە سوودە.

(موتە واتیرات) هەیە ، ئەو هەوالآنەن ئەوەندە بلآون و سواونەوە باس کراون ، ناکرێ گومان لەدرۆیان بکرێ ، وەکو بونی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و سروشی قورئان ، یان فەرموودەی موتەواتیری لە هاتنی مەهدی و مەسیح دا (سەلامی خوایان لێ بێ) یان هاتنی دەجالدا.

زەین ڕونی (الحدس) ئەو هەوالآنەن بە بیرکردنەوەی تیژ دەزانرێن وەکو : خڕی زەوی ، چونکە یەکەمجار کە کەشتی دەردەکەوێ بەشی سەرەوەیەتی پاشان بەشی خوارەوەی دەردەکەوێت.

بێگومان هونەری (بەڵگە) و (هەڵەسازی) زیاتر سودی بۆ ئەوانە هەیە بە شوێن زانستە تیوری یەکان و مەعریفەی ڕاستی یە گەردونیەکاندا دەگەڕێن ، زانینی هونەری ئەرگۆمێنت و بەڵگە لە ڕوی سودەوە ، وەکو زانینی سودەکانی خۆراکە بۆ تەندروستی مرۆڤ ، سودی زانینی هونەری (هەڵەسازی) وەکو زانینی زیانەکانی ژەهرە بۆ تەندروستی مرۆڤ ، بە مەبەستی خۆ لێ پاراستنی (دەمەقاڵێ و دیالەتیك) زیاتر بۆ ئەهلی ئەدیان و زانایانی فیقهی و سیاسی گرنگە ، چونکە بۆ ئەهلی ئەدیان و زانایانی فیقهی و سیاسی گرنگە ، چونکە زۆر پێویستی یان بەدیالۆگ و دەمەقاڵێ یە ، هونەری وتاربێژی و شیعر زیاتر بۆ سیاسی و سەرلەشکران و بانگخوازان و وتاربێژان گرنگە ، بۆ ڕازی کردنی جەماوەر بە بۆچوون و بانگەوازەکەیان .

لە هەموو ئەوانە گرنگتر (بەڵگە) و (دەمەقاڵێ) و (وتاربێژی) یە . قورئان فەرمان دەکات لە بانگەوازی دا ئەم سێ شێوازە بەکاربێنرێن : ( ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة ، وجادلهم بالتي هي احسن) (النمل : ١٢٥).

لێرەدا (الحكمة) مەبەست (البرهان)ە ، (الموعظة الحسنة) بریتی یە لە (الخطابة) و (جادلهم بالتي هى احسن) مەبەست لە (الجدل) ، کە بە باشترین شێوە ئەنجام بدرێت.

(البرهان) یان بەڵگە و ئەرگۆمێنت بریتی یە لە : قیاس وپێك گرتنی لە چەند هەواڵێکی (القضية) یەقینی پێك دێ ، بەخۆی بەناچارییەوە یەقین دەداتە دەستەوە ، گەر بەڵگە (الحجة) لە دوو پێشەکی یەقین بەخش پێك هات

پێ ی دەگوترێ (بورهان – ئەرگومێنت) ئەنجامی بورهان گەیشتنە بەڕاستی و گەیشتنە بەدڵنیایی لە واقیعەکەدا.

دوو جۆر ئەرگۆمێنت و بەڵگە هەیە : (لمِیَ) و (انيَ) : (لمي) : مەبەست لەو بەڵگەیە سنوری ناوەڕاستی (الحد الاوسط) هۆکارە بۆ دانەپاڵە خوازراوەکە لە ئەنجامدا لە زەین و دەرۆشدا لە ڕێگای بەڵگە هێنانەوە بەهۆکار بەسەر هۆگردا دێتە دی ، وەکو : (الذهب معدن ، وکل معدن ينصهر بالحراره ، الذهب ينعهر بالحرارة) واتە : زێڕ کانزایە ، هەموو کانزایێ بە گەرمی دەتوێتەوە ، زێڕ بە گەرمایی دەتوێتەوە .

سنووری ناوەند (الحد الاوسط) لێرەدا (کانزا –معدن) یە ، دەبێ بە هۆکار بۆ سەلماندنی دانەپاڵی (ينصهر بالحرارة – بە گەرمایی دەتوێتەوە) بۆ لای (الذهب – زێڕ) لە زەینی دەرەکی (واقيع)دا ، ئەم بەڵگە (اللمي) دەبەخشێ کە لە (لم)ەوە سەرچاوەی گرتووە ، بەڵگەیێکە لەسەربوون و بە ڕاست دانانی دا ، لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێ نراوە.

بەڵگەی (اني) لە (انيَ) وە هاتووە ، کە پیتێکە لە (حروف المشبه بالفعل) دامەزران و بوون دەگەیێنێ ، ئەو ئەرگومێنت و بەڵگەیەیە (سنوری ناوەڕاست) تێ ی دا هۆکارە بۆ دانەپاڵی خوازراوەکە لە ئەنجامدا لە زەیندا ، لەم نێوانەدا بەڵگە بە هۆگر دەهێندرێتەوە بۆ سەر هۆکار ، وەکو : (محمد طالب ، وکل طالب مجتهد ، محمد مجتهد – النتيجة) واتە : محمد قوتابی یە ، هەموو قوتابییەك تێکۆشەرە ، ئەنجام : محمد تێکۆشەرە.

لێرەدا سنووری ناوەند (الحد الاوسط) بریتی یە لە (الطالب —قوتابی) کە دەبێتە هۆ (علة)ی دامەزرانی (الاجتهاد – هەوڵ) دان بۆ محمد لە زەینداو بەس ، لێرەدا سنووری ناوەند ناوەندێکە بۆ سەلماندن و دامەزراندن (الاثبات) ، ئەم بەڵگەیە (الانية) دەبەخشێ ، کە سەلماندن و بونە ، بۆیە پێ ی دەگوترێ (اني).

هەرچی وتاربێژی (الخطابة) یە : هونەرێکی زانستی یە لەو ڕێگایەوە دەتوانرێ جەماوەر لە مەسەلەو پرسێکدا قەناعەتی پێ بکرێ ، کە چاوەڕێ دەکرێ بە پێ ی توانا بگەیێنرێنە ئەو بڕوایە بە ڕاستی دابنێن.

سوودی وتاربێژی : بریتی یە لە بەرگری کردن لە ڕایێك و ڕۆشن بیرکردنی ڕای گشتی لە مەسەلەو پرسێکدا ، هاندانە بۆ قەناعەت بەخشین لە ڕاست پڕەنسیپێکداو هاندانە بۆ ئەنجامدانی چاکەکان و دوورکەوتنەوە لە تاوان و خراپە کاریەکان و وروژاندنی هەست و ویژدانەکانە ، بە کورتی وتاربێژی زۆر گرنگە لە ڕوی کۆمەڵایەتی یەوە لە ژیانی گشتی خەڵکی دا ، بۆیە پێویستە وتاربێژ ئەو هونەرەیە چاك بزانێت ، کە بە خوێندن و ڕاهێنان و ئەزموون بەدەستی دێن.

سیاسی یەکان و بانگخوازان و خاوەن پڕەنسیپەکان بۆ ڕاکێشانی ڕای گشتی پێویستی یان بە وتاربێژییە ، چونکە جەماوەر گرنگی بە بەڵگەو ئەرگۆمێنت نادات ، بەڵکو سۆزو عاتیفە کۆنترۆڵی دەکات .

(وتار) لە دووبەش پێك دێ : (العمود) واتە : کۆڵەکە . (دووەم) (الاعوان) واتە : یارمەتی دەرەکان .

مەبەست لە (العمود) ماوەی هەواڵەکانی وتاربێژی (القضایا الخطابة) یە کە بەڵگەی قەناعەت بەخشی تێدایەو بڕبڕەی پشتی وتارە.

یارمەتی دەرەکان (الاعوان) : قسەکان و کردارەکان و شێوەو ئاکاری دەرەکی یە ، کە یارمەتی دەردەبن بۆ کارکردنە سەر گوێ گران لەلایەن وتاربێژەوە ، وە هەرچی دیالۆگ و دەمەقاڵێ و شەڕەقسەیە (الجدل) : هونەرێکە بەڵگە لە چەند پێشەکی یەکی تایبەتی دروست دەکات لە (مەشهور)ەکان و بەڵگە نەویستەکان (المسلمات) .

مەبەست لە مەشهورەکان ئەو شتانە دوو کەس ناکۆك نییە لەسەری وەکو (دادگەری و چاکەو ستەم و خراپە).

بەڵگە نەویستەکان ئەو هەواڵ و بڕیارانەن دوژمن وەری دەگرێ با بڕواشی پێیان نەبێت ، وەکو (زەوی وەستاوە) .

وە لێرەدا جیاوازی زۆرە لە نێوان دەمەقالی و بەڵگەدا وەکو :

(١) بەڵگەو ئەرگۆمێنت پێچەوانەی دەمەقالێ دەتوانی لەگەڵ خۆشتدا ئەنجامی بدەیت بۆ ناسینی حەق ، بەلاَم دەمەقالێ لەنێوان دوو کەسدا دروست دەبێ.

(٢) بەڵگە یەك شتە لە هەموو مەسەلەیێکدا ، بەلاَم دەمەقالێ دەتوانرێ هەردوك گروپ بەکاری بێنن ، مادام مەبەست دەم کوت کردنی بەرامبەرە.

(٣) بەڵگە لە مەسەلە حەقیقی یەکاندا ئەنجام دەدریٚ ، بەلاٚم دەمەقالیٚ لە مەسەلەی حەق و ناحەقدا ئەنجام دەدریٚت.

(٤) بەڵگەو ئەرگۆمیٚنت بە (قیاس) ئەنجام دەدریٚ ، بەلاٚم دەمەقالیٚ بە (قیاس) و سۆراغ و تیٚ گەڕان (الاستقراء) و پیٚك چواندن (التمثیل) ئەنجام دەدریٚت.

دەمەقالیٚ سوودی زۆرە ، وەكو :

(١) سەرکەوتن بەسەر بۆچوون و ڕا خراپەکانداو بەهیٚزکردنی ڕاو بۆچوونە ڕاستەکان.

(٢) بەهیٚز کردن و ڕاهیٚنانی زەین.

(٣) بەدەست هیٚنانی حەق و یەقین لە مەسەلەییٚکدا کە لەبەرامبەر مرۆڤدا نمایش دەکریٚت.

(٤) سوودی هەیە بۆ خاوەن بیرو بڕواکان و سەرکردەکان و پاریٚزەران لەکارەکانیاندا.

هەرچی شیعرو هەڵبەستە لای لۆژیکییەکان لە چەند پیٚشەکی یەك پیٚك دیٚ عەقلٚ قبوڵی ناکات ، بەلاٚم سۆزیٚکە دەروون دەهەژیٚنیٚ و سەرەنجی مرۆڤەکان ڕادەکیٚشیٚت ، لە قورئاندا شاعیران دوو بەشن ، شاعیرە خراپەکان : (الشعراء یتبعهم الغاون) (الشعراء ٢٤٤) واتە : شاعیران دوایان دەکەون ، بۆ نمونە : شەڕاب بە یاقوت و مەشروبی ڕوحی دەچویٚنن.

(شاعیرە چاکەکان) : خەڵکی هاندەدەن بۆ چاکەو دوورکەوتنەوە لە خراپە ، بەتایبەتی لە غەزاو بۆنەکاندا (الا الذین امنوا عملوا الصالحات) (الشعراء ٢٢٧).

هەشیانە لەو هونەرانە بە سروشتی دەزانرێن (الفطریات) و پێوانەی خۆیان لەگەڵ خۆیاندایە وەکو : (الاربعة زوج) چوار جوتانەیە ، ئەم پێنج هەوالأنە (القضایا) بە (المقدمات یقینیة) ناسراون ، واتە : دەست پێکە یەقین بەخشەکان ، یان بەڵگە نەویستەکان کە بەڵگەو ئەرگۆمێنت (البرهان) دروست دەکەن ، چونکە ئامانج لە بەڵگە گەیشتنە بە حەق و هاتنەوەیە لەگەڵ ڕاستی دا ، وەکو قورئان فەرموویەتی :

﴿ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ 

البقرة: ١١١

## شیكاری ( التحليل )

شیكاری : بریتی یە لە دابەش كردنی شتێك بۆ بەش و توخمەكانی یان سیفەت و خاسیەتەكانی ، یان لێك دابڕاندنی هەندێ لە بەشەكانی ، پاشان یەك بەیەك لێیان بكۆڵرێتەوە بۆ زانینی پەیوەندی نێوانیان.

شیكاری بۆ دوو بەش دابەش دەبێت :

١- شیكاری سروشتی (الطبيعى-المادي) و شیكاری هزری (لۆژیكی) .

شیكاری سروشتی یان ماددی : لەم بەشەدا شتەكان دابەش دەكرێ بۆ بەشەكانی ، یان توخمەكانی لێك جیادەكرێتەوە لە واقیعی دەرەكی دا ، وەكو : شی كردنەوەی ئاو لە كیمیادا بۆ توخمی (ئۆكسجین) و (هایدرۆجین) بە ڕێژەی (٨) لە ئۆكسجین و بۆ (١) لە هایدرۆجین لە ڕووی كێشەوە .

یان شی كردنەوەی ترشی كاربۆنیك بۆ (١٦) بەش ئۆكسجین و (٦) بەش كاربۆن لە ڕووی كێشەوە .

٢- شیكاری هزری (التحليل العقلي) دابڕینی بەشی شتێكە یان سیفەت و خاسیەكانیەتی لەیەكتری لە زەیندا ، بۆ نمونە : زانای كیمیایی كە لە (زیو) و خاسیەتەكانی دەكۆڵێتەوە ، كاتێ ڕەنگی سپی شی دەكاتەوە ، ئەو سیفەتە لە زەینی دا دادەبڕێ و دڵنیا دەبێ لە تاكەكانی تری زیویشدا هەیە ، پاشان بۆ خاسیەتێ شی دەكاتەوە بەناوی (قبول الفضة للطرق) واتە : زیو چەند ڕێگایێك قەبوڵ دەكات ، دیسان دایدەبڕێ و لە هەبوونی لە تاكی تری زیودا دڵنیایی وەردەگرێت ، پاشان بۆ خاسیەتی تر شی دەكاتەوە ، بەناوی خاسیەتی (خێراگەیاندنی گەرمی و ساردی و كارەبا لە زیودا) ، ئەنجام

دایدەبڕێ و وەکو ڕابردوو لێ ی دڵنیا دەبێ ، ئەم سیفات و خاسیەتانە ئاوا کاریان لە سەردەکات تا کۆمەڵێ سیفەت و تایبەتمەندی کۆدەکاتەوەو وێنەییێکی تەواوی زیو دەبەخشێت.

پێك هێنان (التركيب)

پێناسە : کۆکردنەوەی کۆمەڵە بەشێکی شتێکە ، یان بەستنەوەی کۆمەڵێ سیفات و تایبەتمەندی ئەو شتەیە بە یەکترییەوە بۆ بەدەست هێنانی (چەند یاسایەکی گشتی) پێك هێنان دەبێتە چەند بەشێکەوە .

(١) پێك هێنانی مادی (التركيب المادي) : کۆکردنەوەی کۆمەڵێ بەشی شتێکە ، پێکەوە بەستنەوەیانە بە تۆکمەیی و تەواوی ، تا لە واقیعی دەرەوەدا وەك یەك ئاوێتە دەربکەون ، نمونە : پێك هێنانی کیمیایی ئاوی دەستکردە لە توخمی ئۆکسجین و هایدرۆجین ، کە لە شێوەی ئاوی ئاسایی و سیفەت و خاسیەتەکانی بچێت .

(٢) پێك هێنانی هزری (التركيب العقلی) : بریتی یە لە بەستنەوەی سیفەتەکانی شتێك یان خاسیەتەکانی بەیەکترەوە لە زەیندا.

نمونە : زانایەکی ئەندازەیی هەڵدەستن بە پێك هێنانی سێگۆشەیێك لە سێ هێڵی ڕاستی یەکتربڕ پێك دێت یان چوار گۆشەیێك پێك دێنێ لە چوار هێڵی یەکسان پێك دێت.

## بواری بەکارهێنانی شیکاری و پێك هێنان

بەکارهێنانی ئەم دوو ڕێگایە تەواوی زانستەکان دەگرێتەوە بەزۆری پێکەوە بەکاردێنرێت، بەلاّم ڕێگای (شیکاری) زیاتر لە سروشت ناسی و کیمیاو دەونزانی دا بەکاردێنرێت ، بەلاّم زانستی (پێك هێنان) زیاتر لە ماتماتیکی بەکاردێنرێت.

## دوا وته :

لەم باس و لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان دەرکەوت (لۆژیك – المنطق) وەکو (فەلسەفە و زانست و کەلام و عیرفان و میتا فیزیکا) مەعریفەیەکی سەربەخۆیەو ، چاوگی لە ئاسمانەوەیە ،واتە لەناخی قورئان و نامە ئاسمانیەکانەوە هەڵقولاوە ، وشەی (المنطق) وشەیەکی قورئانی یە (علمنا منطق الطیر) (النمل : ١٦) لە گفتوگۆو دیالۆگی پێغەمبەراندا لە قورئاندا هەموو سەرچاوە مەعریفی یەکان هەڵقولاوە : (هو الذي بعث في الامیین رسولا منهم یتلوا علیهم ایاته ویزکیهم ویعلمهم الكتاب والحكمة وان كانوا من قبل لفي ضلال مبین) .

لێرەدا (یتلوا علیهم) و (التزكیة) و (الكتاب) و (الحكمة) هەموویان کۆمەڵێك مەعریفەی سەربەخۆیان لە قورئانەوە هەڵقولاون و لەسەر زمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پەخش کراون ، (التزكیة) سۆفی گەرییە ، (الكتاب) دەستوورو یاسایە ، (الحكمة) فەلسەفەیە ، (یتلوا علیهم آیاته) لێرەدا مەعریفەی ئاینی یە .

وه (لۆژیك) هەر بە مانای هزرو عەقڵ و بەڵگە دێت ، وشەی (الكلام) یان (زانستی کەلام) لە بەرامبەر (لۆگۆس)ی یۆنانی دا دانراوە ، واتە : (هزر) یان (بەڵگەو ئەرگۆمێنت) (فلسفة) هەر مانای (الحكمة) دێت.

(و (التزكية) واتە : (التصوف) واتە : (پاکژ کردنەوەی دڵ) ، کە پشت بە مەعریفەی میتافیزیك و کەشف و شهودی ئیلهامی مەلائیکی دەبەستێت (زانست) پشت بە ئەزمون و تاقی کردنەوە دەبەستێت ، بەڵام لۆژیك و فەلسەفەو کەلام پشت بە (هزر) دەبەستن ، (ئاین) کە مەعریفەی مەعریفەتانە پشت بە ئلیهام و سروشی ئاسمانی دەبەستێت ، کە تایبەتە بە پێغەمبەران و ڕەوانە کراوانی خوایی هەمووشیان خزمەت بە ئاین دەکەن ، خزمەت بە سەلماندنی بونی خوداو نامەی ئاسمانی و پەسلأن دەکەن (ومن الناس من يجادل في الله بغير علم ولا هدى ولا كتاب منير) (الحج /٨)

ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە سەر سەرچاوە ئاینی یەکان زۆر لە زانایانمان زیادە ڕەوییان کردووە یان کەمتەرخەمییان کردووە لە هەڵبژاردن و هەڵسەنگاندنی هەندێ لەو سەرچاوە مەعریفی یانە بە ئەرێ و نەرێ ی ڕوت و ڕەها ، ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە لە تایبەتمەندی یەکانی خۆیان لایانداوە .

بۆ نمونە :

(١) (حجة الاسلام الغزالي) لە کتێبی (المنقذ من الضلال)دا عیرفان بەسەرچاوەی مەعریفە دەزانێ ، لە کتێبی (قسطاس المستقيم) دا (لۆژیك)

بە مەعریفە دادەنێت ، بەلاّم فەیلەسوفە گەورەکانی ئیسلام وەکو (ابن سینا) و (ابن رشد) کافر دەکات ، لە کتێبی (تهافت الفلسفة) دا ڕەددی (ابن رشد) دەداتەوە ، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە تێ ی کەوتووە .

(٢) (شێخ الاسلام —ابن تیمیة-) لە (ردا المنطقیین) دا پەرچی لۆژیکی و فەیلەسوفان دەداتەوەو بە زەندیق ناویان دەبات ، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە تێ ی کەوتووە .

(٣) دیسان (النسفي) لە (العقائد النسفي) دا هەڵە دەکات کاتێ دەڵێ : سەرچاوەکانی مەعریفە سێ شتە (هەستەکان و هەواڵی ڕاست و عەقڵ) بەلاّم کاتێ دێتە سەر مەعریفەی سۆفیگەری دەڵێ : (والالهام لیس من اسباب المعرفة) ، ئەمەش پێچەوانەی دەیان ئایەتی قورئانە ، پێچەوانەی چەندان فەرموودەی سەحیحە ، پێچەوانەی ڕای عاریفان و زانایانی ترە ، کە عیرفان بە مەعریفەیێکی سەربەخۆ ناودەبەن ، ئەوەتا دایکی موسا بە ئیلهامی فریشتە سندوق بۆ موسا دروست دەکات بیخاتە ناو دەریاوە (واوحینا الی ام موسی) (القصص : ٧) مەریەم خوا لە ڕاستی دا دەفەرمووێ : (اذ قالت الملائکة یا مریم ان الله اصطفاكِ وطهركِ) (ال عمران : ٤٢).

غەزالی لە (المنقذ من الضلال) دا دەڵێ : (سەرەتای تەریقەت بە موشاهەدەو موکاشەفە دەست پێ دەکات ) لە کتێبی (چەند ڕاستی یەك لەبارەی سۆفیگەرییەوە) کە لەژێر چاپدایە بەدرێژی باسی ئەو بابەتەمان کردووە .

(٤) شيخ الاسلام (الرازي) لە (الاشارة في علم الكلام) دا دەڵێ : (زانستی کەلام) بەرێزترینی زانستەکانە ، هەموو زانستەکان پێویستیان بە ئەوە کەچی هەندێ لە زانایانی وەکو (ابن تيمية) و زانایانی هاوچەرخ ڕەددی زانایانی کەلام دەدەنەوە ، وەکو (المتكلمون في ذات الله وصفاته والرد عليهم/ د: صابر عبدالرحمن طعيمة) و ئەشعەرییەکان تاوانبار دەکات .

یان گروپی موعتەزیلە عەقڵی یەکان تاوانبار دەکات کە بە (عەقڵ) و لۆژیک وەکو پەرژینێك بوون بۆ ئیسلام عەقیدەکەی ، بێگومان ئیسلام مەعریفەی مەعریفەکانە ، دوایی عیرفان دێ کە پشت بە کەشفی دڵ دەبەستێ ، پاشان دەور بە عەقڵ و هەستەکان دەدات کە وەکو مەعریفە سودیان لێ وەربگیرێت و ئەرگۆمێنتەکانیان لەبەرچاو بگیرێت ، چونکە هەموو ئەو سەرچاوە مەعریفی یانە لە خزمەت قورئان دان و ڕاڤەیێکن بۆ ئەو و وەکو پەرژینێك وان دەیپارێزن.

ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر) لە ستایشی ئەوانەدا دەفەرمووێ : (العلم نهر ، والحكمة بحر ، والعلماء حول النهر يطوفون ، والحكماء وسط البحر يغوصون والعارفون في سفن النجاة يسيرون) ، واتە : زانست ڕوبارێکە ، فەلسەفەو لۆژیك و دانایی دەریاییێکە ، زانایان لە دەوری ڕوباردا دەخولێنەوە فەیلەسوفان و کەلامی یەکان و لۆژیکەکان لە ناوەڕاستی دەریادا دەچنە ناوییەوە ، عاریفەکان بە کەشتی رزگاری دەڕۆن.

لێرەدا پێشەوا عەلی (مەعریفەی عیرفانی) بە کەشتی ڕزگاری ناو دەبات ، کە مرۆڤ تووشی خنکان ناکات ، بەڵام مەعریفەکانی تر سنورێکی بەرتەسکیان هەیە و مەترسی خنکانیان لێ دەکرێت ، گەر هەڵنەگوازن بۆ عیرفان و پشت بە ئەویش نەبەستن .

(سبحانك ربك رب العزة عما يصفون والسلام

على المرسلين والحمدلله رب العالمين).

٢٠١٥/٣/١٤ حاجیاوا / رانیه

## هەندێ لە چەمکە لۆژیکی یەکان لەم کتێبەدا

| المنطق | لۆژیك – ژێر بێژی |
| --- | --- |
| العلم | زانست |
| التصور | وێناکردن |
| التصدیق | بە ڕاست دانان - سەلماندن |
| مقول | گوتە – گوتەزا – کاتی گوری |
| اللفظ | وشە |
| المفرد | تاك |
| المرکب | ئاوێتە – پێك هاتە – تێکەڵاو |
| المعنی | واتا |
| المفهوم | چەمك |
| الجزئي | هەندەکی – بەشەکی |
| النست الاربع | چوار دانە پاڵەکان |
| استثنائي | دەرهاویشتە – هاوێردن |
| الکلیيات الخمس | پێنج هەمەکی یەکان |
| الذاتي | خودی |
| العرضي | ڕواڵەتی – وارس – تاسەرەکی |
| التعریف (الحد) | پێناسە |

| | |
|---|---|
| الحدود | سنور |
| التضاد | دژ – وێك نەچوو |
| الاستدلال | بەڵگەکاری – بەڵگە هێنانەوە |
| القضايا | هەواڵ – بڕیار – واچە |
| الحملية | هەڵگری |
| الشرطية | مەرجی یە |
| اتفاقية | ڕێککەوتن |
| المتصلة | لکاو |
| المنفصلة | نەلکاو – سەربەخۆ |
| التلازم | نوسان |
| الوضع | دانان |
| المطلوب | مەبەست – داواکراو |
| نوع | جۆر |
| جنس | ڕەگەز |
| سالب | نەرێ (نێگەتیف) |
| موجب | ئەرێ (پۆزەتیف) |
| تقسيم | بەش کردن |
| تصنيف | پۆلێن کردن |
| المقدمة | پێشەکی |
| المنقول | گوازراوە |

| | |
|---|---|
| التالی | پاشەکی |
| مقبول | پەسەند – قبول کراو |
| النتیجة | ئەنجام |
| علاقة | پەیوەندی |
| مطلق | ڕەها |
| مظنونات | گومان هەلگرەکان |
| مبدء | پرەنسیپ |
| الرفع | لادان (لابردن) |
| فرضیة | گریمانە |
| نظریة | بیردۆزە –تیور |
| الوعي | هۆش |
| معیار | پێوەر – سەنگی مەحەك |
| محسوسات | هەست پێ کراوەکان – بەرجەستەکان |
| العقل – معقولات | هزر |
| الذهن | زەین |
| الاستدلال غیر مباشر | بەلگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆ |
| عملي | کرداری |
| التلازم بین القضیتین | نوسان لەنێوان دوو هەولدا |
| التطبیقی | پراکتیکی |

| العكس المستوى | پێچەوانەی ئاست |
|---|---|
| عكس النقيض | پێچەوانەی دژ |
| نظري | تیوری – بیردۆزی |
| الاستدلال المباشر | بەڵگەهێنانەوەی ڕاستەوخۆ |
| محتمل | ئەگەرە |
| القياس | پێوانە ، پێك گرتن |
| الاقتران الحملي | یەكگرتنی هەڵگری |
| وهمی | وەهمی |
| الاشكال الاربعة | چوار شێوەكان (فۆڕمەكان) |
| فصل | جیاكار |
| الاستقراء | لێكۆڵینەوە ، تێ گەڕان |
| جوهر | جەوهەر ، كرۆك |
| التمثيل | وێچواندن |
| حدسية | ژیرگەری – بیر ڕونی |
| التحليل | شی كردنەوە – شیكاری |
| محصور | قەتیس كراو |
| التركيب | پێك هێنان |
| الصناعات الخمس | پێنج هونەرییەكان |
| منهج البحث العلمي | ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی |
| كيفية | چۆنیەتی |

| ماهیة | چی یەتی |
|---|---|
| وجود | بوون |
| عدم | نەبوون |
| ممکن | شیاو |
| واجب | پێویست |
| علة | هۆکار |
| معلول | هۆگر – هۆکرد |
| البرهان | بەلگە – ئەرگۆمێنت |
| مصدقات | بەڕاست دانراوەکان – سەلماوەکان |
| الصغری – الکبری | گچکە – گەورە |
| الیقینیات | یەقینی یەکان – دڵنیا بەخشەکان |
| اولیات | بەرایی یەکان |
| مشاهدات | بەرچاوەکان – دیمەنەکان |
| مجربات | تاقی کراوەکان |
| متواترات | موتەواتیرەکان |
| الجدل | دەمەقاڵێ - دەمەتەقێ |
| الخطابة | وتاربێژی - بێژاندن |
| الشعر | شیعر - هەڵبەست |
| المغالطة | هەڵەسازی |
| مانعة الجمع | ڕێگری کۆبوونەوە |

| | |
|---|---|
| مانعة الخلو | ڕێگری تیا نەبوون |
| الموضوع | بابەت |
| المهلة | بێ سنوور |
| العرض العام | ڕواڵەتی گشتی – ناسەرەکی گشتی |
| العرض الخاص | ڕواڵەتی تایبەتی – ناسەرەکی تایبەتی |
| العرض اللازم | ڕواڵەتی نوساو |
| تصنيف | پۆلێن کردن |
| الحد التام | پێناسەی تەواو |
| الحد الناقص | پێناسەی ناتەواو |
| قوة | هێز |
| فعل | کردار |
| محمول | هەلگیراو |
| الموجبة الكلية | ئەرێنی هەمەکی |
| السالبة الكلية | نەرێنی هەمەکی |
| السالبة الجزئية | نەرێنی هەندەکی |
| حدالاصغر | سنوری گچکە |
| حدالاوسط | سنوری ناوەند |
| حدالاكبر | سنوری گەورە |

# سەرچاوەکان

١. القرآن الكريم

٢. ايساغوضى / اثيرالدين المفضل ابن عمر بن المفضل الابهري المتوفى (٦٦٣هـ) هاشمي/ ط٢/ استنبول/٢٠١٤ .

٣. خلاصة المنطق / العلامة الدكتور عبدالهادي الفضلي / مؤسسة التأريخ العربي.

٤. مغني الطلاب / تحقيق محمود رمضان البوطي/ دار الفكر (ط/٢٠٠٣).

٥. مدخل الى علم المنطق / مؤسسة المعارف الاسلامية الثقافية .

٦. دروس في علم المنطق / السيد حسين الصدر / دار الكاتب العربي / ط١ / ٢٠١٣ م.

٧. القلائد الدراسية على الفوائد الفنارية / صبغة الله المريادى التلوي / هاشمي / استنبول/ ط١ / ٢٠١٣.

٨. المستصفى من علم الاصول / اي حامد الغزالي / دار الكتب العلمية / ط٢ / ٢٠١٠ / لبنان.

٩. المقرر في شرح منطق المظفر/ السيد رائد الحيدري ايران / ذوى القربي/ تأريخ البطع ١٤٣٣.

١٠. الرسالة / الامام الشفعي / دار ابن جزم/ الام/ ج١/ ط١/ ٢٠٠٥ م / لبنان.

١١. غيث الهوامع / الامام الحافظ العراقى / دار الكتب العلمية / بيروت / لبنان.

١٢. التعريفات / للسيد الجرجاني / مؤسسة التأريخ العربي / بيروت / لبنان / ٢٠٠٣ م.
١٣. الموسوعة الفلسفية / د.عبدالرحمن البدوي / ط١٤٢٧ / تم / ايران.
١٤. الملل والنحل / لفيلسوف الشرستاني / دار ابن حزم / ط١ / ٢٠٠٥ م.
١٥. الله يتجلي في عصر العلم / ضون كلو فرومونسا.
١٦. الفوائد الفنارية / للعلامة شمس الدين الفناري / الهاشمي / تركيا / اسطنبول.
١٧. تحرير القواعد المنطقية / للعلامة قطب الدين محمد بن محمد الرازي / هاشمي / المكتبة الهاشمية / تركيا.
١٨. اصول الفقه / للشيخ المظفر / المؤسسة الاعلى / بيروت.
١٩. المعجم الفلسفي / د. جميل صليبا / ذوي القربى / ط١.
٢٠. دراسات في الفلسفة اليونانية / حسين صالح حمادة / دار الهادي / ط١ / ٢٠٠٥ م.
٢١. رسالة الشمسية / العلامة سعدالين التفتازاني / دار زين العابدين / ايران / ٢٠١٢ م.
٢٢. المنطق واصول الفقه / الشيخ احمد ولد محمد محمود / دار الكتب العلمية / ط١ / لبنان.
٢٣. الملتطقة في المنطق / العالم الفاضل الملا عثمان دار قته ئي / دار كردستان للنشر والتوزيع / ط١ / سنندج.
٢٤. المنطق والمعرفة عند الغزالي / د.غلام حسين ابراهيم ديناني/ دار الهادي / ط١ / ٢٠٠٤ م.

٢٥. مێژووی پەروەردەو حوجرە لە کوردستان/ حمە کریم هەورامی / هەولێر / ٢٠٠٨ز.
٢٦. لۆژيك و هونەری ئەرگۆمێنتازی / فاروق رفيق / کتێبی یەکەم / ٢٠١٤.
٢٧. المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفية / د. عبدالمغم الحنفي / مكتبة مدبولي / قاهرة / ط٣/ ٢٠٠٣م.